یۆستین ۆردەر

# ژیان کورتە

## (نامەیەک بۆ قەشە ئا ۆستین)

وەر ێڕانی: ڕێبوار سیوەیلی



کوردستان – هەولێر
٢٠٠٥



**ناوی کتێب: ژیان کورتە (نامەیەك بۆ قەشە ئا ۆستین)**

- ژانر: ڕۆمان
- نووسینی: یۆستین ۆردەر
- وەر ێڕانی: ڕێبوار سیوەیلی
- نەخشەسازی ناوەوە: ۆران جمال رواندزی
- بەرگ: هۆ ر سدیق
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- ژمارەی سپاردن: ٦٧٨
- چاپی یەکەم
- نرخ: ١٥٠٠ دینار
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب – ٤١– (١٤٤)

**ناونیشان**
**دەز ای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی**
پۆستی ئەلکترۆنی: asokareem@ maktoob.com
ژمارەی تەلەفۆن: 2260311
www.mukiryani.com

# ناوەڕۆک

# پێشەکی وەرگێڕ

*{.. ئەوساتەی پرچە درێژەکانمت ئاوەڵاکردن تا بۆن بەعەترەکەیانەوە بکەی، لەسەر گەردنم هەستم بەهەناسەت کرد. وەك ئەوەی بتەوێ سەراپای بوونم هەڵمژێتە ناو خۆتەوە، مەبادا جێگەی من ناو دەروونی بوونی تۆ بێت. هەر بەوجۆرەی لە من نزیکبوویتەوە، ئاواش لە پێناوی بەخشینی ڕۆحی خۆتتدا فرۆشتمت. چ خیانەتێ، ئۆرڵ، چ گوناهێك!.. **ئەگەرەکو خودایەك هەیە، لێگەڕێ با چاو دە گوناهەکانی تۆ بپۆشێ. بەشکم ڕۆژێکیش بەو هۆیەوە کە جەنابت پشتت لە هەموو چێژەکانی ژیان کرد، دادگاییت بکا. تۆ ئەڤین ڕەت دەکەیەوە، ڕەنگە ئەمە قەبووڵ بکرێ، وەلێ (بۆچی) بەناوی خوداوە ئەڤین ڕەتبکرێتەوە؟..** من بڕوا بە خودایەك ناکەم کە ژیانی ئافرەتێ دەخاتە سارایێ لەپێناوی ئەوەیدا گوناهەکانی پیاوێ ببەخشێ.}* .

نامەوێ بەهۆی ئەم چەند لاپەڕەیەوە هیچ چێژێ لە خوێنەر زەوت بکەم کە بۆی هەیە لە میانەی خوێندنەوەدا ئەزموونی بکا، بەڵام پێمخۆشە بە ڕاشکاوی بڵێم: ئەو چەند دێڕەی سەرەوە ڕاستەوخۆ دەمانباتە ناو شێواز و بابەتی ڕۆمانەکەی گۆردەرەوە: فلۆریا ئامیلیا نامەیەك بۆ قەدیس ئاگۆستینی بەناوبانگ دەنووسێ و تیایدا خۆشەویستی خۆیانی بیردەخاتەوە کە کرایە قوربانیی عەشقی ئاسمانی. نووسەرێکیش کە یۆستین گۆردەرە، دەستنووسێکی دۆزیوەتەوە و ئەمەش خەیاڵی ئەو دەخاتە جووڵە بەجۆرێ کە بتوانێ خزمەتی لایەنی فەلسەفی، مێژووی کەنیسە و ڕەهەندی کولتووریی پێبکات. هەروەك چۆن ئەم دەقە چیرۆکی خۆشەویستییەکە، ئاواش دەکرێ



وەکو توێژینەوەیەك بخوێندرێتەوە، کە چۆن یەزدانناسیی مەسیحایی هەر لەسەرەتای دروستبوونییەوە، ژیانی ئافرەتێ ڕووبەڕووی ناکامی و تێکشکان دەکاتەوە. لە نامەکەدا فلۆریا هەوڵدەدات خۆشەویستییەکەیان وەك پەیوەندییەکی نمونەیی و ڕاستەقینە زیندوو بکاتەوە، بەڵام هەر هەمان خۆشەویستیش لەلایەن ئاگۆستینەوە دەکرێتە قوربانیی تیۆلۆژیا.

ئەوەی کەمێ شارەزای ژیانی ئاگۆستین بێت و دانپیانانەکانی خوێندبێتەوە، زوو تێدەگات کە نووسەری ئەم ڕۆمانە بەوپەڕی وردبینییەوە سوودی لەو بەسەرهاتانە وەرگرتووە کە ئاگۆستین لەو کتێبەیدا نووسیونی.

لە مێژووی ئایین و خوداناسیی مەسیحیدا، ئاگۆستین بە دامەزرێنەری تیۆلۆژیا (یەزدانناسی) دادەنرێ. ئەو کە لە ساڵی (٣٥٤)ی زایینیدا لە شاری تاگاستە، کە دەکەوێتە جەزائیری ئێستاوە، لەدایکبووە، بە درێژایی ژیانی لەلایەن (مۆنیکا)ی دایکییەوە کۆنترۆڵ کرابوو. ئاگۆستین کە بڕوانامەکەی لەبواری وتاربێژیدا بەدەستهێنابوو، لە ڕۆژانی هەرزەکاریدا لەگەڵ کیژۆڵەیەکی نەناسراودا چووە ناو پەیوەندییەکی خۆشەویستیی دوورودرێژەوە و پێکەوە کوڕێکیان بوو. لەو دەمەی کۆمەڵگای ڕۆمیدا، ئەمجۆرە پەیوەندییە یاساخ نەبوو، بەڵام بە هاوسەرگیرییەکی پلە نزم لەقەڵەم دەدرا. بۆیە مۆنیکای دایکی ئاگۆستین هەموو توانایەکی خۆی دەخاتە کار بۆ ئەوەی پەیوەندییەکەیان هەڵوەشێنێتەوە و ئاگۆستین لەگەڵ خانمێکی هاوپێگە و هاوشانی خۆیدا هاوسەرایەتی بگرێ. مۆنیکا لەمەدا تا ئەندازەیەك سەرکەوتن بەدەست دەهێنێ: ئەو کیژۆڵەیە لە ئاگۆستین دوور دەخاتەوە و یەکێکی دیکەی بۆ خوازبێنی دەکات، بەڵام پێکدی شاد نابن.



سە...ی ئەو چیرۆکەیە کە گۆردەر لەم ڕۆمانە قەشەنگەدا کاری لەسەر دەکات: ئەو ژ...ڵە نەناسراوەکە ناو دەنێ (*فلۆریا ئامیلیا*) و دەیەوێ بڕوا بە ئێمەش بهێنێ کە ئەو نامەیەی لە کتێبفرۆشەکەی شاری (بۆینۆس ئایریس)دا، دۆزیویێتییەوە، ئەم فلۆریایە بۆ ئاگۆستینی نووسیوە!

خاڵی سەرەتا بۆ فلۆریا لە دوای خوێندنەوەی (***دانپیانانەکان)ی*** ئاگۆستینەوە دەستپێدەکات، کە بەپێی گێڕانەوەکەی گۆردەر، فلۆریا لەو کتێبەدا بۆی ئاشکرا دەبێت ئاگۆستین هەم بەسەرهاتی خۆشەویستییەکەیانی زۆر گۆڕیوە و هەم لە ئاست چەندین ڕووداویشدا بێدەنگەی کردووە. لێرەوە وەك لە ڕیوایەتەکەی گۆردەردا هاتووە، فلۆریا بڕیار دەدات نامەیەك بۆ ئاگۆستین بنووسێ و تیایدا هەم ڕاستیی ئەو بەسەرهاتانە بەیانکات، کە ئاگۆستین شێواندوونی و بەمەش درۆی نووسەرەکەی ئاشکرا بکات، هەم ئەو ڕووداوانەش بهێنێتەوە دەنگ کە دەبوو ئاگۆستین لەبەردەم یەزداندا باسیکردبان و کەچی بێدەنگەی لێکردوون. بەمجۆرەش دانپیانانەکانی ئاگۆستین، کە لە مێژووی ئەدەبیات و داهێناندا بە یەکەمین ژیاننامەنووسی دەروونشیکارانە ناونووسکراوە و بریتیە لە دانپیانانی ئاشکرای نووسەرەکەیان بە گوناهەکانی خۆی لەبەردەم یەزداندا، بۆ فلۆریا ئامیلیا، سیما و ناواخنێکی دیکە بەخۆیەوە دەگرێ. بەلای فلۆریاوە ئەم دانپیانانە پێش هەمموو شتێك کتێبێکە تیایدا قەشەی پایەبەرزی هیپۆ، بە ئارەزووی خۆی چیرۆکی خۆشەویستیەکەیان دەڕێسێ و بە درۆ و ڕاست، (دەیگێڕێتەوە و نایگێڕێتەوە). ئەوەی دەگێڕێتەوە، لەزۆربەی کاتدا ڕاست نییە و ئەوەش کە نایگێڕێتەوە، هەڵگری حەقیقەتگەلێکی وردە سەبارەت بە پەیوەندیی خۆشەویستیەکەیان. بۆیە فلۆریا لە میانەی نامەکەی خۆیدا، (کە هیچ نییە جگە لە خەیاڵی دەوڵەمەند و ناسکی یۆستین گۆردەر زیاتر)، جارێ گاڵتەجاڕانە



و گاهێ بەوپەڕی جیدیەتەوە، بەبیری قەشەی دەهێنێتەوە، کە چۆن ئەو لە پێناوی عەشقی هەمیشەیی و ئەو دنیاییدا، کە زۆر کەم لەبارەیەوە دەزانێت، دەست لە ئەڤینی نمونەیی و ڕاستەقینەی مرۆڤ هەڵدەگرێ. ئەو ئەڤینەی کە تا ئێستا لە نێوان فلۆریا و ئاگۆستیندا بوو، لەپڕ دەبێتە خۆشەویستییەکی گوناهبارانە و هەستەوەرانە: ئەمەش لە ڕیوایەتی ئاگۆستینیدا بەوە پاساو دەدرێتەوە کە بڵێت: (*یەزدان لە سەرووی هەمموو شتێکەوە خوازیاری ژیانێکی پاکژانەیە بۆ من*). بەڵام ئەوەی بۆ ئاگۆستین حەقیقەتە، بەلای فلۆریا ئامیلیاوە درۆکردنە، بۆیە جەنگی نێوان گێڕانەوە و نەگێڕانەوە لەوپەڕیدایە، فلۆریا دەنووسێ:

(*ئۆرلێ، وەی بێ وەفا. ئەو کاتەی منت لە خۆت دوور خستەوە، گوناهی چ خیانەتێکی لووتبەرزانەت گرتە ئەستۆ. دڵت لە لای من و برینێکی ئەوتۆی لێهاتبوو کە خوێنی لێ دەچۆڕا. ئەگەر درکاندنی ئەم قسەیە تیماری دەردێ بکا، پێویستە بڵێم هەڵبەتا دڵی منیش برینێکی هاوشێوەی تێدابوو، چونکە ئێمە دوو ڕۆح بووین کە لێکیان جوێ کردبووینەوە. یاخۆ ئەگەر حەز بکەی، دوو جەستە بووین، یان لە ڕاستیدا دوو ڕۆح بووین لە یەك جەستەدا. برینەکەی تۆ چاك نەبۆوە، سووتێنەر و دەردەداریش بوو تا سەرەئەنجام چڵکی کرد و تۆش کەمتر هەستت بە ئازارەکەی کرد. وەلێ بۆچی؟ چونکە تۆ ڕزگاریی ڕۆحی خۆت لە من زیاتر خۆشدەویست. قەشەی پایە بەرز: چ ڕۆژگارێکە، ئەوەی تۆ کردت عەجەب ڕەفتارێکە!*)

ئالێرەدایە کە فلۆریا ئامیلیا بە زمانێکی گاڵتەئامێز و لەهەمان کاتیشدا ئازاراوی، لە ئاگۆستین دەپرسێ: ئایا ئەوە خیانەتێکی ڕەها نییە کە خۆشەویستەکەت لە پێناوی بەدەستهێنانی بەخشندەیی یەزداندا جێبهێڵیت؟ **(**چ خیانەتێ، ئۆرلێ، چ

[illegible]. من بڕوا بە خودایەك ناكەم كە ژیانی ئافرەتێ دەخاتە سارایێ لەپێناوی [illegible]یدا گوناهەكانی پیاوێ ببەخشێ.). ئایا ئەمە دەستپێشخەری ئاگۆستینی قەدیس نەبوو بۆ ئەوەی ڕچەشكێنی بۆ باوەڕدارانی مەسیحی بكات، تا لەسایەی ئەو ئایینەدا چۆن مامەڵە لەگەڵ ئافرەتدا بكەن؟ و ئایا ئەمە خوێندنەوەیەكی ڕەخنەگرانەی گۆردەری ڕۆماننووس نییە بۆ ئەو كولتوورە ئایینییەی كە بەوجۆرە وێنای ئافرەتی دەكرد و لەسێبەری ئەوەشدا چەندین تاوانی گەورەی وەك (سووتاندنی جادووگەران) لە مێژووی ئەورووپادا، ئەنجامدران؟ *(تۆ ئەڤین ڕەت دەكەیەوە، ڕەنگە ئەمە قەبووڵ بكرێ، وەلێ (بۆچی) بەناوی خوداوە ئەڤین ڕەتبكرێتەوە).*

ئاگۆستین بەوەی تەركی دنیای كرد، خۆی بەدوور گرت لەهەمموو ئەو خۆشی و گەرموگوڕییەی ڕۆژگارێ لەگەڵ مرۆڤێكی دیكەدا بەشی كردبوو و پێكەوە ئەزموونیان دەكرد. فلۆریا دیسانەوە دەپرسێ: (ئایا ئەوكاتە تۆ لە یەزدانەوە دوور بوویت؟) و بەردەوامیش ئەو قسەیە بەبیری ئاگۆستین دەهێنێتەوە كە لەكاتی ئەڤینداری و دەستلەملانێدا دووبارەی كردۆتەوە: *(ڤیتا بیرڤیس)*، واتە: ژیان كورتە.

وێڕای توانای شایستە و خەیاڵی داهێنەرانەی گۆردەر لە نووسینی ئەم ڕۆمانەدا، دەكرێ كارەكەی بە نزیكبوونەوەیەكی جیدی و گفتوگۆیەكی قووڵ لەگەڵ هزری فەلسەفیی سەدە ناوەنجییەكانی دوایی لەقەڵەم بدرێ، كە خۆی لەخۆیدا گفتوگۆیەكی قووڵە لەسەر ڕەگوڕیشە و بونیادەكانی كولتووری خۆرئاوایی بەتایبەتی و مرۆڤایەتی بە گشتی.

گۆردەر بە نووسینی ئەم دەقە جارێكی دیكە بەبیرمان دەهێنێتەوە، كە هیچ نووسین و هیچ نووسەرێك بێ دەمامك نییە، تەنانەت ئەگەر ئەو نووسەرە ئاگۆستینی قەدیس و



نووسینەكەشی (دانپیانانەكان)ی ئەو بێت لەبەردەم یەزداندا. بەمجۆرەش نووسەر هەر بەتەنیا خۆی و خوێنەرەكانی ناخەڵەتێنێ، بەڵكو لە توانایدایە یەزدانیش بخەڵەتێنێ. وەلێ چێژی خوێندنەوە چییە ئەگەر هەوڵدان نەبێت بۆ هەڵدانەوەی ئەو دەمامكانەی نووسەر بەكاریان دەهێنێ و ئاشكراكردنی ئەو نهێنیانەی بەشاراوەیی هێشتوونییەوە.

لە ژیانی كورتی هەمووماندا فلۆریا ئامیلیایەك هەیە! پێویستە چاوەڕێ بین ڕۆژگارێ فلۆریا ئامیلیای ناو ژیانمان نامەیەكمان بۆ ڕەوانە بكات و بەبیرمان بهێنێتەوە: كە بەڕاستی ئەوەی ئێمە لەسەر خۆمان گوتومانە و ڕیوایەتمانكردووە، دیوێكی تەنكی ئەو حەقیقەتەیە كە لێی بێدەنگ بووین.. بۆیە من ئەم وەرگێڕانە پێشكەش دەكەم بە ئەو، كە تاهاتمەوە و نیشتەجێ بووم، ئەو سەفەری كرد و كاتێ ئەویش گەڕایەوە، ئیدی من لەمێژ بوو لەو شوێنە نەمابووم كە لێوەی دەستمانپێكردبوو. وەكئەوەی هەردووكمان بۆ هەمیشە لە ژیانی یەكتردا مردبووین!

هاوینی ٢٠٠٥

## پێشەکی نووسەر

لە بەهاری ساڵی ١٩٩٥دا، کە بۆ بەشداریکردن لە پێشانگای کتێبی (بوینۆس ئایرس) چووبوومە ئەرجەنتین، هاوڕێکانم جەختیان لێکردم پێشنیوەڕۆیەك دابنێم بۆ چوونە سەردانی بازاڕی ڕۆژانی هەینیی بەناوبانگی (سان تیلمۆ). دوای چەند کاتژمێرێ پیاسە و گەشتکردن بە دوکان و بازاڕەکەدا، دواجار پەنام بۆ کتێبفرۆشێکی بچکۆلە برد کە کتێبی کۆنی دەفرۆشت. لە نێوان چەند نوسخەیەك دەستنووسی کۆنینەدا چاوم کەوتە سەر سندووقێکی سوور کە لێی نووسرابوو (نوسخەی فلۆریا). بێگومان شتێ سەرنجی ڕاکێشابووم تا سندووقەکە بە هێواشی بکەمەوە و لە بەستەیەك کاغەزی دەستنووس ورد ببمەوە. گومان لەوەدا نەبوو کە کۆن بوون، زۆر کۆن و لەوەش بترازێ تێگەیشتم دەقەکان بە لاتینی بوون.

سڵاوی سەرەتای نوسراوەکە لە ڕستەیەکدا و بە پیتی گەورە نووسرابوو: (**سڵاو لە فلۆریا ئامیلیاوە بۆ ئۆرلیۆس ئاگۆستین، قەشەی شاری هیپۆ...**) کەواتە دەبوو نامە بێت، ئایا بەڕاست ئەم نامەیە دەشیا بۆ هەمان ئەو خوداناس و باوکەی کەنیسە بێت، هەمان خوداناسی کە لە نیوەی سەدەی چوارەم بەدواوە، زۆرترین ڕۆژەکانی ژیانی خۆی لە سەرووی ئەفریقا ژیاو ئەم نامەیەشی لەلایەن کەسێکەوە بۆ نووسرابێ کە خۆی ناونابوو *فلۆریا* ؟



من ئەودەم بەباشی ئاگاداری ژیاننامەی ئاگۆستین بووم. هیچ سیمایەکی دی بەو ڕوونییەی ئەو نەیتوانیبوو ئەو گۆڕانە کولتوورییە سەر سوڕهێنەرانە پیشانبدات، واتە تێپەڕین لە دنیای کولتووری دێرینەی یۆنانی-ڕۆمییەوە بەرەو جیهانی کولتووری مەسیحی، کە هەتاکو ئەمڕۆکەش جێدەستی خۆی لەسەر ئەوروپا بەجێهێشتووە. هەڵبەتا باشترین سەرچاوە لەسەر ئاگۆستین، هەر ئاگۆستین بۆخۆیەتی. ئەویش لە ڕێگەی پەرتووکی *دانپیانانەکان*ییەوە، کە لە دەوروبەری ساڵی (٤٠٠ی پ.ز)دا نووسراوە (Confessions، c.Hoo AD). ئەو لەو پەرتووکەدا تێڕوانینێکی بێنموونە هەم لەسەر سەدەی چوارەمی پڕ ئاژاوە بە شێوەیەکی گشتی و هەم لەسەر گیرۆدەبوونە ڕۆحییەکانی خۆیشی سەبارەت بە بڕواداری و گومان، دەخاتە ڕوو. وادیارە ئاگۆستین لەچاو خەڵکانی پێش سەدەی ڕێنیسانسدا، نزیکترین کەسە لە ئێمەوە.

کێ بوو ئەو ئافرەتەی توانیبووی ئەم نامە دوور و درێژەی لەبۆ بنووسێ، کە ٧٠-٨٠ لاپەڕەی ناو سندووقەکەی دەگرت؟ من قەتاوقەت سەبارەت بەم بەڵگەنامەیە شتێکم نەبیستووە. هەوڵمدا ڕستەیەکی دیکەش تەرجەمە بکەم: (*بەڕاستی سەرسوڕهێنەرە کە بەم شێوەیە ڕووی قسەکانم دەکەمە تۆ. ڕۆژگارێکی زۆر زۆر بەر لە ئێستا تەنێ دەمنووسی (بۆ ئۆرلی بچکۆلەی شۆخ و شەنگم*). زۆر لە وەرگێرانەکەم دڵنیا نەبووم، بەڵام گومانم نەبوو لەوەی نامەکە بەشێوەیەکی زۆر زۆر تایبەتی داڕێژرابوو.

ئەودەم شتێکم بە خەیاڵدا هات. نەکا نامەی نێو ئەو سندووقەسوورە لە لایەن ئەو کچەوە بێ کە ساڵانێکی دوور و درێژ ئەڤینداری ئاگۆستین بووە؟ واتە لەلایەن خانمێکەوە کە ئاگۆستین، بە گوتەی خۆی، ناچاربوو دەریبیکات چونکە بڕیاری دابوو پاشماوەی تەمەنی خۆی بەدوور لە هەموو چێژێکی جنسی بباتە سەر؟ موچڕکێ بە

ڕەی پشتمدا هات، چونکە باش دەمزانی پەیڕەوکارانی ئاگۆستین شتێ لەبارەی ئەم ردنە بەختڕەش و ئەو ساڵانەی لەگەڵ ئەودا ژیا بوو، جگە لەو شیکردنەوەیەی خودی ئاگۆستین لە دانپیانانەکانیدا خستبوویە ڕوو، هیچی تریان نەدەزانی.

ئەوەندەی پێنەچوو خاوەنی دوکانەکە هاتە لامەوە، ئاماژەی بۆ کاغەزی ناو سندووقەکە کرد. من هێشتا ئەفسوونکراوی گرنگیی دەستنووسێ بووم کە خەریك بوو هەڵمدەسەنگاند.

گوتی: (شتێکی نایابە، وانییە؟

(بەڵێ پێموابێ...)

لە تەلەفزیۆن و بڵاوکراوەکاندا سەبارەت بە پێشانگاکە چەند چاوپێکەوتنێکیان لەگەڵ کردبووم، ئەوەتا خاوەنی دوکانەکەش منی ناسیبۆوە:

- جیهانی سۆفیا؟

سەرێکم لەقاند، پاشان بەسەر سندووقەکەدا نوشتایەوە و دەرگاکەی داخست و بە ڕێکوپێکی خستییە سەر کۆمەڵێ دەستنووسی دی، وەك ئەوەی بیەوێ تێم بگەیەنێ کە زۆر سوور نییە لەسەر فرۆشتنی. ڕەنگە تۆزێکیش دوودڵتر بووبێ چونکە ئیدی دەیزانی من کێم.

لێم پرسی: (نامەیەك بۆ قەشە ئاگۆستین؟).

وا هاتە پێش چاوم زەردە خەنەیەکی تاڵ گرتی.

(لەو بڕوایەدایت راستەقینە بێت؟)



گوتی: (بۆچی نا.. هەمووی چەند کاتژمێرێ نابێ بە دەستم گەیشتووە، هەڵبەتە ئەگەر دەمزانی ئەمە ئەو بەڵگەنامەیەیە کە بۆخۆی بانگەشەی دەکا، ئێرە جێگەی نەدەبوو).

(چۆن بە دەستتان گەیشتووە؟)

پێکەنی و گوتی: (ئەگەر حەزم لە کڕیارەکانم نەکردبا، ئەوەندە لەسەر ئەم کارە بەردەوام نەدەبووم.)

وام هەستکرد خەریکە بە داوی خۆمەوە دەبم. لێم پرسی:

(چ نرخێکت لەسەر داناوە؟

( پانزە هەزار پیزۆ).

*پانزە هەزار پیزۆ* وەك سیخورمەیەك بوو بۆ ناو دەم. ئەویش بۆ دەستنووسێ کە بێ چەند و چوون چەند سەد ساڵ تەمەنی هەبوو، بەڵام بۆ خۆی دەیگوت نامەیەکە لە دڵخوازەکەی ئاگۆستینەوە. ئەوپەڕەکەی دەکرا بگوترێ نامەیەکە بۆ باوکی کەنیسە، کە تا هەنووکە بە نەناسراوی مابۆوە، یان دەشیا نوسخەیەکی لەبەر هەڵگیراوەی دەستنووسێکی کۆنتر بێ. بەڵا، بۆی هەبوو لە سەدەکانی حەڤدەیەم و هەژدەیەمدا لە یەکێ لە دەیرەکانی ئەمەریکای خوارووداً نووسرابێتەوە. بەڵام ئەوەندەش بۆ خۆی شتێکی دەگمەن بوو، دەکرا لەگەڵ خۆت بیبەیەوە ئەوروپا. وەڵا ئەوەشم گوێ لێبوو کە گوایە دەنێو تاقمە ئایینیەکاندا جاروبار نامەی ساختەی لەمجۆرە بۆ قەدیسێکی کاتۆلیکی، یان بە ناوی ئەوەوە نووسراون.

کتێبفرۆشەکە سەرقاڵی داختسنی دوکانەکەی بوو، کاتێ کارتی متمانەکەمم دایە،

گوتم: ( دوانزە هەزار پیزۆ)

بلە[illegible] بوو لە دەوروبەری سەد هەزار کرۆندا. ئەویش بۆ شتێ کە دەکرا بە هێچ و[illegible]یەك دەگمەن و نایاب نەبێ. وەلێ تازە وەسوەسە گرتبوومی و یەکەمین کەسیش نەبووم لە تاو وەسوەسەکانی پارەیەکی زۆری دەدا. ساڵەهای ساڵ لەمەوبەریش، ئەو کاتەی بۆ یەکەمجار کتێبی دانپیانانەکانم دەخوێندەوە، کۆشابووم خۆم بخەمە شوێنی ئەم دڵخوازەی ئاگۆستین، تێڕوانینی ئاگۆستینیش سەبارەت بە ئەڤینی نێوان ژن و مێرد، لە دنیای مەسیحیدا و لەپشت خۆیەوە، نیشانە گەلێکی زۆر ڕوونی بەجێهێشتووە.

کتێبفرۆشەکە پێشنیارەکەمی پەسەند کرد و گوتی: (لەو بڕوایەدام ئەگەر ئەم سەودایە ناوبنێین *بڵاوکردنەوەی مەترسی* لە هەمووشتێ باشتر بێت.)

سەرم لەقاند، چونکە لە مەبەستی قسەکەی تێنەگەیشتم. پاشان ڕوونی کردەوە: (لەدوو حاڵەت بەدەر نییە، یان من مامەڵەیەکی زۆر باش دەکەم یاخود تۆ).

تایبەتمەندییەکانی کارتی متمانەکەمی نووسی و پاشانیش بە داماوییەوە گوتی: (تەنانەت بۆخۆشم فریا نەکەوتم دەقی ئەم دەستنووسە بخوێنمەوە. لەماوەی چەند ڕۆژێ تردا یا ئەوەتا نرخەکەی چەندین جار هەڵدەستا یانژی سندووقەکەم فڕێدەدایە زبڵدانی ئەو گۆشەیەوە.)

تەماشایەکی ئەو سەبەتە زبڵەم کرد کە ئاماژەی بۆ کردبوو، پڕبوو لە کتێبە گیرفانییە کۆنەکان. لەسەر ئەو پارچە کاغەزەش کەبە لێواری سەبەتەکەیەوە چەسپاندبووی، نووسیبوی (دوو پیزۆ).

ئەوە من بووم سوودێکی زۆرترم لەو سەودایە وەرگرتبوو. (نوسخەی فلۆریا) مێژوی کۆتایی سەدەی شانزەیەمی بەسەرەوە بوو، ئەمە جگە لەوەی دەتوانرێ بگوترێ لە



ئەرژەنتین نووسرابوو. پرسیاری سەرەکی ئێمە ئەوەبوو ئایا ئەو نوسخەیەی کە (نوسخەی فلۆریا)یان لەبەر هەڵگرتبۆوە، بەڕاستی هەبووە یان نەء ؟

من چیتر سەبارەت بە ڕەسەنایەتی نامەکە دوودڵ نیم و گومانیش ناکەم لەوەی ئەمە لەلایەن هەمان ئەو خانمەوە نووسراوە کە ساڵانێکی زۆر دڵخوازی ئاگۆستین بووە. هەرگیز بۆ ئەوە ناچم کەسێ لە کۆتایی سەدەی شانزەیەمدا و لە ئەرژەنتین ئەم ساختەیەی کردبێ. بەم پێیەش لەگەڵ هەبوونی هەر گریمانەیەکدا، باشتر وایە قەبووڵی بکەین کە ئەم نامەیە هی سەردەمی ئاگۆستین خۆیەتی ماوەتەوە. هەرچی چنین و وشەی نامەکەشە ئەوە دەردەخەن کە لەدڵی دواڕۆژەکانی مێژووی سەردەمی کۆنەوە سەریان هەڵدابێ. ئەمە جگە لەو ئاوێزانبوونەی هەستی فلۆریا لەگەڵ ئەو هەستی تێدامانی ئایینییەدا کە ڕووبەڕووی دەتەقێتەوە.

لەپایزی ١٩٩٥دا لەگەڵ خۆمدا دەستنووسەکەم برد بۆ ڤاتیکان (لەئیتالیا) تا شیکردنەوەیەکی وردتری لەسەر بکرێ. بەڵام کۆمەکێکی ئەوتۆم پێنەکرا، بە پێچەوانەوە: لە ڤاتیکان سوور بوون لەسەر بانگەشەکردنی ئەوەی کە هەرگیز شتێکیان بە ناوی (نوسخەی فلۆریا)وە بەدەست نەگەیشتووە. سەرم لەمە سووڕنەما، هەرچەندەش ناتوانم بە ئاسانی ئەوە پەسەند بکەم، کە نامەکەی فلۆریا هی کەنیسەی کاتولیکی بێت.

هەڵبەتە نوسخەیەکی فۆتۆکۆپیم لەبەر دەستنووسەکە هەڵگرتەوە و لە بەهاری ١٩٩٦دا هەوڵمدا عەبایەکی نەرویجیانەی بەبەردا بکەم. وەلێ لەهەر شوێنێکی نامەکەدا شتێ لە دانپیانانەکانی ئاگۆستینەوە گواسترابێتەوە، گەڕاومەتەوە بۆ

وەرگێڕە شایانەکەی ئۆدمۆند هیلیدە (Hjeelde Oddmund) لە دەکتێبی پیانانەکاندا.

کاری وەرگێڕانەکە وەك چنینی پارچە میکانۆکان لەپاڵ یەکدا، زۆر زەحمەت بوو. بچووکترین کێشەی ئەم کارە نەبوونی ژمارەی لاپەڕەکانی بوو. لە هەمان کاتیشدا هەلێکی زۆر باش بوو تا زمانە لاتینییەکەم، ـ کە ڕۆژگارێ تیایدا زۆر باش بووم ـ سەر لەنوێ زاخاو بدەمەوەـ من ساڵانێك لەوەپێش لە قوتابخانەی کەنیسەی گەورەی ئۆسلۆ ئەم زمانە فێربووم (١٩٦٨-١٩٧١) و دەبێ هەزاران جار ستاییشی مامۆستا لاتینییەکەم *ئۆسکار فیلد* بکەم.

جێی سەرسوڕمانە ئەوەی چۆن سەرفی کردار و ناوە کۆنەکان لە زەینی مرۆڤدا دەچەسپێن، لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا ئەگەر یارمەتی پایە بەرزانەی *ئۆڤیند ئاندەرسن* نەدەبوو، ئەوە هەرگیز ئەم وەرگێڕانە نەدەهاتە بەرهەم. لێرەشدا پێویستە سوپاسی هاندانەکان و ڕێنماییە بەسوودەکانی *ترۆندبێرگ ئێرکسن و ئیگل کراگرود، ئۆیڤیند نۆردڤاڵ و کاری ڤۆگت* بکەم.

هیچ شتێ ئەوەندە بەختەوەرم ناکات کە لە پاداشتی بڵاوکردنەوەی ئەم نووسخەیەی (فلۆریا)دا حەزێکی زیاتر لە هەمووواندا بۆ فێربوونی زمانی لاتینی سەرهەڵدا.



## سیپارەی یەکەم

سڵاو لە فلۆریا ئامیلیاوە بۆ ئۆرلیۆس ئاگۆستین، قەشەی هیپۆ.

بەراستی سەرسورهێنەرە بەجۆرە رووی قسان لە تۆ دەکەم. رۆژگارێ زۆر زۆر بەر لە ئێستێ، بە سانایی دەمنووسی (بۆ ئۆرلی چووکەڵەی شۆخ و شەنگم). وەلێ ئێستەکانێ دەساڵ بەسەر ئەو حەڵەدا تێپەڕیوە کە دەستەکانت تێدەئاڵاندم و زۆر لە شتەکانیش گۆڕاون.

بۆیەش ئەمەت بۆ دەنووسم چونکە قەشەی قەرتاجنە مۆڵەتی دام دانپیانانەکانی تۆ بخوێنمەوە.

ئەو لەو بروایەدایە خوێندنەوەی کتێبەکانی تۆ دەتوانێ ژنێکی وەکو من بخاتەوە سەر رێ. بتەوێ و نەتەوێ ئەوە ساڵانێکە من پەیوەندیم بە دەستەی کەنیسەیی[1] ئێرەوە کردووە و بوومەتە شاگردی قوتابخانەی مەسیحی، ئەمما ئۆرل، قەتاوقەت رێگەیان پێنادەم تەعمیدم بکەن. ئەگەرچی هیچ کام لە عیسای مەسیح ولە چوار ئینجیلەکەش بەسەر سەرمەوە نەوەستاون بۆ ئەو کارە، وەلێ خۆم بەدەست تەعمیدکردنەوە نادەم.

کتێبی شەشەمدا نووسیوتە: (ڕێگەیان نەدا بەو ژنەی لەگەڵیا دەژیام لە لامەوە بێ. لە منیان جوێ کردەوە لەبەر ئەوەی ڕێگربوو لەبەردەم ژنهێنانمدا. من کە بە توندی دڵم لە گڕۆی ئەودابوو، هەلاهەلا کراو برینێکی خوێناوی لێهات. ئەو بەرەو ئەفریقیا گەڕایەوە و پەیمانی بە تۆ[٢]دا هەرگیز لەگەڵ پیاوێکی دیکەدا نەژی. ئەو کوڕەکەمانی[٣] لەلای من بەجێهێشت.).

چ باشە کە دەبینم هیشتاکەش لە بیرتە هەردووکمان تا چەند گیرۆدەی یەکتری بووین، تۆ دەزانیت کە نزیکیی ئێمە مانای زۆر زیاتری هەبوو لە هاوهێلانەیی باوی ژن و مێردەکان لە پێش هاوسەرێتیدا. ئێمە زیاتر لە دوانزە ساڵی تەواو وەفادارانە پێکەوە ژیاین و یەزدان مناڵێکی پێداین. چەندە زۆر بوون ئەو کەسانەی مەیان دەدیت، وایاندەزانی هاوسەری شەرعی یەکترین. لەوەش بترازێ، ئۆرل، خەیاڵی ئەوە دەکەم ئەمەش دەبووە مایەی لوتبەرزی تۆ، چونکە زۆربەی پیاوەکان شەرم لە ژنەکانی خۆیان دەکەن. ئەو پیادەڕێیەی سەر پردی ڕووباری (ئارنۆ)ت لە بیر ماوە، کە لە پڕ دەستێکت خستە سەر شانم و ڕاتگرتم وشتێکت پێ گوتم؟ لە بیرتە؟

چەندین جار نووسیوتە زۆر شتت بە نەگوتراوی جێهێشتووە، زۆر شتت بیرچۆتەوە. پێویستە بمبووریت لە وەی یەکدوو خاڵی گرنگت بیر دەخەمەوە.

ئەوە ڕاستە کە من قەولم دا پیاوێکی دی نەناسم، وەلێ خۆ ئەو قەولەم بە یەزدان نەداوە. مەگەر تۆ نەبووی تکات لێکردم پەیمانێکی وەهات پێبدەم؟ من لەم بارەیەوە هیچ دوو دڵ نیم، چونکێ ئەو دەمەی بە تەنیا لە میلانۆوە[٤] گەڕامەوە بۆ نیشتمان، ئەمە تەنیا شتێ بوو منی دڵگەرم کرد. ئاخر (ئەو کاتەش) هێشتا تۆزقاڵێ دڵت بۆ من لێدەدا. پێشدەچوو مۆنیکاش[٥] ڕای خۆی بگۆڕێ و دیسانەوە ئەمن و تۆ بتوانین



بازوومان لە دەوری یەکدی ئاڵێنین. لەبەر ئەوەی مرۆ داوای وەفاداری لە کەسێ ناکات کە تووڕەیی و نەفرەتەوە لە خۆی دوور خستۆتەوە. چەند ڕستەیەك لەوە دوا دەنووسی: (*ئەو برینەی لە پاش بچڕانی پەیوەندیم بەو ئافرەتەی لە تەکیدا دەژیام، لە دڵم هات، چاك نەدەبۆوە. سەرەتا خوێنی لێ دەچۆڕا و ئازارێکی سەختی هەبوو، پاشانیش چڵکی گرت و کەمتر هەستم بە ئازارەکەی دەکرد*)[٦] بەڵێ، باوابێ، هەڵبەت دیسانەوە دێمەوە سەر ئەم هەستیاری و ئازار و چڵك گرتنە.

هەردووکمان باش دەزانین کە تەنێ لەبەر ئەوە منیان لە تۆ دوور خستەوە، چونکێ مۆنیکا کیژێکی گونجاوی بۆ تۆ دۆزیبۆوە. هەڵبەت ئەوە بەهانەی مونیکا بوو، ئەو بیری لە داهاتووی بنەماڵەکەی دەکردەوە. یان ژی تۆزقاڵێکیش ئیرەیی بە من دەبرد، ئەمەت قبوڵ نییە؟ وای چەنێ بیرم لەم بابەتە کردۆتەوە. قەتاوقەت ئەو بەهارەم بیر ناچێتەوە کە ئەو لە وێنەی گەردەلوولا هاتە میلانۆ و خۆی هاوێشتە نێوان من و تۆ.

وەلێ ئەوە هەردووکتان بوون کە منتان پاڵ پێوەنا و هۆکارە سەرەکییەکەشی پلانی ژن هێنانی تۆ نەبوو، بەڵکو شتێکی تریش لە ئارادا بوو. گوتت لەبەر ئەوەی لە خۆمت جوێ دەکەمەوە چونکە بێ سنوور خۆشمدەوێی. هەڵبەت لە باری سروشتیدا دەبێ مرۆڤ لە پاڵ یارە خۆشەویستەکەیدا بمێنێتەوە و بەرگری لێ بکات، وەلێ تۆ دەقاودەق بە پێچەوانەی ئەمەوە ڕەفتارت کرد. هۆکەشی ئەوە بوو تۆ ئیدی بە چاوی کەم تەماشای ئەڤینی نێوان ژن و پیاوت دەکرد. وا بیرت دەکردەوە من، تۆ بە دنیای هەستەوەرییەوە دەبەستمەوە، ئەمەش لە کاتێکدا ئیدی ئارامی و قەرارت لە بەر بڕا بوو تا خۆت بۆ ڕزگاریی ڕۆحی تەرخان بکەیت. لە ئەنجامیشدا هیچ شتێ لەو

بێن[illegible] ڕێکخراوەت سەوز نەبوو. نووسیوتە، (یەزدان لە سەرووی هەموو شتێکەوە ئازاری ژیانێکی پاکژانەیە بۆ من). چەنێ سەختە بڕوا کردن بە خودایەکی ئەوتۆ.

ئۆرڵ، وەی بێ وەفا. ئەو کاتەی منت لە خۆت دوور خستەوە، گوناهی چ خیانەتێکی لووتبەرزانەت گرتە ئەستۆ. دڵت لە لای من و برینێکی ئەوتۆی لێهاتبوو کە خوێنی لێ دەچۆڕا. ئەگەر درکاندنی ئەم قسەیە تیماری دەردێ بکا، پێویستە بڵێم هەڵبەتا دڵی منیش برینێکی هاوشێوەی تێدابوو، چونکە ئێمە دوو ڕۆح بووین کە لێکیان جوێ کردبووینەوە. یاخۆ ئەگەر حەز بکەی دوو جەستە بووین، یان لە ڕاستیدا دوو ڕۆح بووین لە یەك جەستەدا. برینەکەی تۆ چاك نەبۆوە، سووتێنەر و دەردەداریش بوو تا سەرەئەنجام چڵکی کرد و تۆش کەمتر هەستت بە ئازارەکەی کرد. وەلێ بۆچی؟ چونکە تۆ ڕزگاریی ڕۆحی خۆت لە من زیاتر خۆشدەویست. قەشەی پایە بەرز: چ ڕۆژگارێکە، ئەوەی تۆ کردت عەجەب ڕەفتارێکە[٧]

ئایا قەت بیرت لەوە نەکردەوە چۆن کارەکە گەیشتە ئێرە؟ لە بارەیەوە شتێ لە دانپیانانەکانت بە دی ناکرێ. وەلێ ئایا خیانەتێ لەوە گەورەتر هەیە مرۆ لە پێناوی ڕزگارکردنی ڕۆحی خۆیدا خۆشەویستەکەی وێڵ کات؟ ئایا بۆ ئافرەتێ بەرگەگرتنی ئەمە ئاسانترە، یان ئەوەی مێردەکەی لە پێناوی هاوسەرگرتندا دەستی لێهەڵگرێ، یاخود فەزڵی ژنی دیکە بدات بەسەردا؟

وەلێ ژنێکی دی لە ژیانی تۆدا نەبوو. تۆ تەنێ ڕۆحی خۆت زیاتر لە من خۆشدەویست. ڕۆحی خۆت، ئۆرڵ، ئەمە ئەو شتە بوو کە دەتویست ڕزگاری بکەیت، هەمان ئەو ڕۆحەی کە سەردەمانێ لە ئامێزی مندا ئارامی گرتبوو. تا ئەو دەمەش کە منت هەبووم هەرگیز حەزت لە هاوسەرداری نەدەکرد و دەتگوت، هاوسەرگیری



تەنێ ئەنجامدانی ئەرکێکی فەرزەندییە و هیچی تر. قەتیش ژنت نەهێنا، هاوسەرەکەت خەڵکی ئەم دنیایە نەبوو. کوڕەکەشمان لە نێواندا بوو، یەزدانیش بۆ خۆی ئاگادارە کە من بە هەمان ئەندازە دایکی (ئادیۆتادۆس) بووم کە تۆش باوکی ڕاستەقینەی بوویت. ئەوە من بووم لە زگمدا هەڵمگرت و منیش بووم لە مەمکی خۆم شیرم دایێ، چونکە دایەنی نەبوو، کەچی تۆ دەنووسی من لە لای تۆم بەجێهێشت و ڕۆیشتم. (ئەوە بزانە) هیچ دایکێ بە ئارەزووی خۆی ئەمکارە ناکات و تاقانە کوڕەکەی خۆی بە بێ هەدادانی ئازاراویترین زەحمەتەکان، وێڵ ناکا. وەلێ بە نەبوونی تۆ لە پاڵمدا دەبوو داوای هیچ نەکەم چونکە من خاوەنی هیچ شتێ نەبووم. مەگەر هەر لەبەر ئەو هۆیەش نەبوو کە مۆنیکا دەویست تۆ لەگەڵ کیژی دەوڵەمەندێکدا ببیە هاوسەر؟ وا دەبینم ئەوە قسەی یۆنانییەکە، کە دەبێژێت: (*دە نێوان خەڵکە یەکسانەکاندا نەبێ، دادپەروەری بە کارنایەت*)[٨]

لە کتێبی نۆیەمدا دەستەودامێنی خودا بوویت تا *دانپیانانەکانت* لێ وەرگرێ و لەپاڵ ئەمەشدا هەزار شتی دیکەت پەردە پۆش کردووە. یەکێ لەو شتانەی پەڕاندووتن، دوا دیداری ئێمەیە و وادیارە ئەمکارەشت بە عانقەست کردووە، بۆچی تەنانەت بە تاقە وشەیەکیش سەبارەت بەوەی سالێکی تەواو لە ڕۆما، پێش گەڕانەوەت بۆ ئەفریقا، کردت، هیچت نەدرکاندووە. بۆ کەسێ کە دەیەوێ بەو جۆرە شێلگیرانەیە بیرەوەریەکانی بنووسێ، ئەو کارە هێندەش جێ ی سەربەرزی نییە.

ئەدی ئێستا سەبارەت بەوەی لە ڕۆما ڕوویدا چ دەڵێیی؟ ئۆرڵ، ئەوە چ بەڵایەك بوو بە سەرماندا هات؟ عەوداڵبوونی مەعنەوی تۆ بە دووی ڕۆحتدا، وا پێدەچێ دەنێو ئەو ژوورە نابوودەی (ئاونتین)ەوە دەستی پێکردبێ. دڵنیام بیستبووت کە من بە هەر شێوەیەك بووبێ گەیشتوومەتە (ئۆستیا). لەوێش بە خێرایی هۆیەکانی سەفەرم پەیدا

[illegible] بە لەبەرچاوگرتنی بارودۆخەکەش، سەفەرەکەم بە باشی تێپەڕی و کەمترین [illegible] ئەوە بوو گەڕامەوە قەرتاجنە. ئەم جارەشیان ئەوەی کاروباری سەفەرەکەی تەرتیب دابوو هەرتۆ بوویت. ئەوەش دووەمین جار بوو دەگەڕێندرامەوە بۆ ئەفریقا، رێکو راست وەك کاڵایەکی بازرگانی. تازە زۆر بەسەر ئەو سەردەمەشدا ڕابردووە و برینەکانیش سارێژ بوون.

لە پازدەساڵ بەر لە ئێستاوە کە لە(میلانۆ)وە گەڕاومەتەوە تا ئەم ساتە، بەردەوام پێم ناوەتە سەر شوێنپێیەکانی تۆ. یان ڕاستر وایە بڵێم بەهەمان ئەو ڕێگایانەدا ڕۆیشتووم کە پێکەوە لە قەرتاجنە تەیمان دەکردن. سەرەتا هەرچییەکم لە بارەی فەلسەفەوە چنگ دەکەوت دەمخوێندەوە. ئاخر دەمویست تێبگەم چ خەسڵەتێ لە فەلسەفەدا هەیە کە دەبێتە هۆی جیابوونەوەی دوو کەسی ئەڤیندار. ئەگەر دڵت خستبووە گرۆی ئافرەتێکی ترەوە، ڕەنگە حەزم بە دیتنی کردبا. وەلێ ناحەزەکەی من ئافرەتێکی دی نەبوو، بەڵکو بنەمایەکی فەلسەفی بوو. کەواتە بۆ ئەوەی باشتر لێت حاڵی بم، دەبوو یەکێ لەو ڕێگایانەی تۆ پێیاندا ڕۆیشتبوویت هەڵبژێرم و هەمان ڕەوت بگرمە بەر. دەبوو فەلسەفە بخوێنمەوە.

ناحەزەکەی من تەنێ ناحەزی (من) نەبوو. ئەو ناحەزی هەر ژنێکە، ئەو فریشتەی مردنی ئەڤین بوو[٩] کە تۆ ناوی دێنی دووره پەرێزی، ئۆرڵ، دە کتێبی هەشتەمدا نووسیوتە: (*ئەوجا بۆم هەڵکەوت تا پاکژی و داوێنپاکی لە جوانیی نایابی خۆیدا ببۆزمەوە، ئارام و مەست، بەبێ هیچ پەلەکردنێ لە شادمانیدا. بەو پەڕی دۆستایەتی دڵڕفێنانەیەوە فەرمووی بەرەو پیری بچم ، ئەو دەم دەستە پاکژەکانی کردنەوە تا من لە ئامێز بگرێ*)[١٠].



بەو چەند پەیڤانە چیت نەگوتووە[١١]. تەنانەت هەوڵیش نادەی بیشاریتەوە کە چۆن ڕێگەت بە خۆت داوە تاکو فریوت بدەن. سەرپێچی لەوە ناکەم (بڵێم) ڕێك و ڕاست لە کاتی خوێندنەوەی ئەم بەشەدا دڵم لە حەسرەتان پێچی دەخوارد. مەگەر ئەو دەمەی کەفوکوڵی لاوێتی لەمەدا کلپەی دەسەند، بێکەم و زیاد هەر ئاوا خۆتت نەدابووە دەستی من؟ ئایا منیش بە هۆی (دۆستایەتی دڵڕفێنانەمەوە) هەوڵم نەدا لە باوەشمت بگرم؟ وا هەست دەکەم دەمەوێ هاودەنگ لەگەڵ هۆراس (Horace)دا بڵێم : کاتێ گەمژەکان نایانەوێ هەڵە بکەن، ڕێك و ڕاست پێچەوانەکەی دەکەن)[١٢].

منیش وەکو تۆ بە(خوێندنەوەی) سیسەرۆ دەستم پێکرد[١٣] تۆ لەبارەی ئەوەوە لە کتێبی سێیەمدا دەنووسی: (*ئەوەی بە تایبەتی لە ئامۆژگارییەکانی سیسەرۆدا حەزم لێی بوو، ئەوە بوو کە ناچاری نەدەکردم تا لە فەلسەفەدا ئەم یان ئەو لایەنە بگرم، بەڵکو (هانیدەدام) ڕاستیم خۆشبوێ و عەوداڵی بم و بیدۆزمەوە..*)[١٤].

ڕاستییش، ئۆرڵ، ئەو شتە بوو کە خرۆشاندمی بۆ خوێندنەوەی بەرهەمی فەیلەسووف و شاعیرە مەزنەکان. هەر چوار ئینجیلەکەشم خوێندەوە. لەو دەمەوە کە لێکدی جوێ بووینەوە، ئەمن هەموو کاتێ خۆم بۆ ڕاستی تەرخان کردووە هەربەو جۆرەی کە تۆ پشتێنت لێ بەست تا خۆت بۆ پاکژی تەرخان بکەیت. تۆ هێشتا لە لای من عەزیزی، هەرچەندێ پێویستە ئەوەش زیاد بکەم و (بڵێم) ئەوڕۆکە بۆ من ڕاستی عەزیزترە[١٦]. ئەوەتا ئێستێ لە قەرتاجنە بە ژنێکی زانام تێدەگەن کە وانەی تایبەتی دەڵێتەوە. ئەرێ بۆت سەرنجڕاکێش نییە بیربکەیتەوە کە ئێستێکە ئەوە منم مامۆستای هونەری ڕەوانبێژیم؟ نابێ خۆش سەلیقەییەکەشت نەمابێ؟ چما لە دانپیانانەکاندا شتێ لەمەڕ خۆش سەلیقەییەوە بەدی ناکرێ، ئۆرڵ؟ وەلێ ئەو کاتەی پێکەوە بووین، بەو جۆرەی نەبووی. دەمانتوانی لە سبای ساڵحانەوە تا کوتایی شەو

[illegible] پێکەنین. ڕەنگە ئیدی گاڵتە و خۆشتەبعی بەلاتەوە چەمکێکی تایبەت بە [illegible]ێژی جەستەیی) یان (لەشپەرستی)یەوە بێ.

وێڕای ئەمانەش، پێویستە لەبەر کتێبەکانت سوپاست بکەم. هیچ کتێبی دی[17] بەو باشییە یارمەتی منی نەدا تاکو تێبگەم بۆچی سەرەتا ویستت لە من جیا بیتەوە بۆ ئەوەی دان بەخۆتا بگری تا کیژۆڵەیەکی یازدە ساڵی باڵق ببێ و شووت پێبکات، پاشانیش بڕیارتدا ئەو مێخودایە بپەرستی کە ناوت نا بوو (خۆ پاریزی، یان داوێنپاکی). ئەز، کە جاربەجارێ یادەوەریت بەپیرتەوە نایەت، شتێکی ترە و ئەمیش یەکێکە لەو هۆکارانەی من (نامە)ت بۆ بنووسم. بە گوتەی تاکیتۆس لە بەلاّدا خەمخواردن بەشی ئافرەتانە و یادکردنەوەش شایستەی پیاوان[18]، وەلێ، ئۆرلّ، تۆ تەنانەت بیریشت ناکەوێتەوە.

سێ نامەم لەبەردەمدان. یەکێکیانت ڕێك لە پاش ئەوەی سەرەنجام لە ژنهێنان پەشیمان بوویتەوە، لە میلانۆوە بۆ ناردم و هێشتاکە چەند مانگێ بەسەر ئەوەدا تێپەری نەکردبوو کە من ناچار بەجودابوونەوە کرابووم. پاشانیش ئەو نامەیەت گەیشت کە لە دوای مەرگی مۆنیکاوە لە ئۆستیاوە بۆت ناردم.

چ لوتفێکت کرد کەڕێگەت دا لە لاوە (ئادیۆداتۆس)یش پەیامێکی بچکۆلە بۆ دایکی بنووسێ. یەکدووساڵ لـــەوەدواش نامەیەکی دی هات، دوای ئەوەی بچکۆلەکەت لە دەستدابوو. ئەرێ لەو کاتەدا کەسێ ئەسیرینەکانتی دیتــبوون؟

گومانم نییە لەوەی لەو بڕوایەدایت ئەو منداڵە بۆیە نەخۆشکەوت و مرد چونکە لە گوناهدا هێلکەی پیتابوو؟ ئایا وانییە؟



ئەمەش لەبەر ئەوە دەپرسم چونکە بۆ خۆت دە کتێبی نۆیەمدا نووسیوتە و لەوێدا ئادیۆداتۆست بە میوەی گوناهی خۆت زانیوە. هەڵبەتە ئەوەشت زیادکردووە کە یەزدان (*توانای ئەوەی هەیە کارە دزێوەکانی مە بگۆڕێ بۆ شتی جوان*)[19]

نووسیویشتە بەشی تۆ لەو منداڵەدا تەنێ ئەو گوناهەبوو. ئۆرلّ، شەرمەزار بە، تۆ *بۆخۆت* ناوت لێنا ***ئادیۆداتۆس***[20]

بێگومان باوەڕت بەوە نییە کە خواوەند بۆیە ئەو کوڕەی بردەوە چونکە دەیویست دەستی تۆ لە کاری قەشەیی و ئەسقەفیدا کراوە بێ. بەڵکو خودا خەیاڵە خاوەکانیشت ببەخشێ.

ئۆرلّ، کوڕێ مردووە.. حەق وا بوو بێیە لای من کەمێ پێکەوە بگرین، من و تۆ. تۆ (ئەو دەم) هێشتا لە کەنیسەدا پێگەیەکت نەبوو و جارێ پەیمانی هاوسەرداریشت نەبەستبوو، ئەوە جگە لەوەی ئادیۆداتۆس تاقە کوڕی ئێمە بـــــوو. وەلێ وابزانم تۆ سەبارەت بەوەی لە ڕۆما ڕوویدابوو، ئەوەندە شەرمەزار بوویت کە بوێری ئەوەت نەبوو دەگەڵ مـــــــن ڕووبەڕوو وەبی؟ یانەخۆ دەترسایت لەوەی نەکا هەمان ڕووداو ڕووبداتەوە؟

نازانم بۆ ئەوەندەت بەلاوە زەحمەتە. (باس لە) کتێبی نۆیەم دەکەم، ئۆرلّ. ئایا بەڕاست لەو بڕوایەدایت پیشاندانی ماتەمی مەسەلەیەکی ئەوەندە جەستەیی بێ؟ تۆ تەنانەت ڕێگەت بە کوڕەکەشت نەدا لە کاتی ماڵئاواییکردنیدا لـــە دایەگەورەی، بگری. من لەو بڕوایەدام خۆدزینەوە لە گریان (جەستەیی)ترە، چونکە ئەگەر تێر نەگرین، ئـــەو خەمە وەك بارێکی قورس لەسەر دڵمان دەمێنێتەوە. ئارام بێ یادی ئەو کوڕە یار و هاودەمە.



## سیپارەی دووەم

هەروەکو ئاماژەم پێدا، توانیم دانپیانانەکانی تۆ بە ئامانەت لە قەشەی قەرتاجنە وەربگرم. لێم ببورە کەلێرەدا برێ لە دەربڕینەکانی دەهێنمەوە، چونکە دەمەوێ لە پاشاندا ئاماژەیان بۆ بکەم. هیوادارم میزاجی ئەوەت هەبێ تێڕوانینەکانی من بە زەینێکی گەشەوە بخوێنیتەوە، یان ئەگەر حەز دەکەیت (دەڵێم) دانپیانەکانم؟ ئەمەش لەبەر ئەوەی ئەم نامەیە شتێکی زیاترە لەوەی پیرۆزباییکردنێکی تایبەت بێ لەتۆ، هاوکات ئەمە نامەیەکیشە بۆ ئەسقەفی (هیپۆرگیۆس).

کاتێکی زۆر بەسەر ئەو سەردەمەدا تێپەڕیوە کە من و تۆ باوەشمان بۆ یەکتر دەکردەوە و لەو حەلەوە ڕووداوگەلێکی زۆریش ڕوویانداوە. لەمڕۆشەوە بۆی هەیە (ئەم نامەیە) نامەیەك بێ بۆ بەردەم هەموو کەنیسە مەسیحییەکان، چونکە ئیدی ئەورۆکە تۆ پێگەیەکی بڕیاردەریت.

هەرچەندە دان بەوەدا دەهێنم تەسەوورکردنی ئەم خاڵە بەندی دڵم دەلەرزێنێ، وەلێ لە یەزدانیش دەپارێمەوە، پیاوانی کەنیسەش حەوسەڵەی گوێگرتنیان لەدەنگی ئافرەتێك هەبێ. ئەرێ هیچت لەو بارەیەوە بیرماوە کە ئەو بەیانییە لە کاتی ڕۆیشتنندا لە



فۆڕوم ڕۆمانۆم (Romanum Forum) پێمگوتی، ئەو دەمەی تەنکە بەفرێکمان بینی کە لاپاڵی (پالاتینی) داپۆشیبوو؟ من باسی تراژیدیای (میدئیا)ی (سنیکا)م بۆ کردی، کە تازە خوێندبوومەوە. لەو شانۆیییەدا نووسراوە پێویستە گوێ بۆ قسەی بەرامبەریش بگرین، کە منم[٢١].

کتێبی یەکەم بەپێشەکییەکی ئومێدبەخش دەستپێدەکات، لەو جێیەی تۆ دانایی و مەزنی خواوەند ستاییش دەکەیت، نووسیوتە: (هەمووشتێ لەتۆوەیە، لەڕێگای تۆوەیە و لە بوونی تۆدایە)[٢٢] پاشان دێیە سەر باسی سەردەمی منداڵی خۆت، هەرچەندە بە مەزەندەی من زۆرینەی تێبینییەکانی خۆتت لەسالآنی یەکەمی تەمەنی ئادیۆداتۆسەوە وەرگرتوون، وەلێ هەر لە سەرەتاوە ئەو ڕیتمی داماوی و بێتاقەتکەرەی وەك داوێکی سوور بەتەواوی کتێبەکەدا درێژ دەبێتەوە، ئاشکرایە: (*هیچ کەسێ لە بەرامبەری تۆدا بێگوناه نییە، تەنانەت ئەو مەلۆتکەیەی تەنێ یەکرۆژ لە جیهاندا ژیاوە.. بۆی هەیە دەست و قاچی بێ ئیرادەی ئەو تازە لە دایکبووە بێگوناه بن، بەڵام ڕۆحی ئەو بێگوناه نییە*). ئەرێ بەراست بۆ چی نا؟ ئیدی چونکە کوڕێکی بچکۆلەت دیوە (لە خەماندا ڕەنگی زەرد و لە بارێکی پشێودا) تەماشای براکەی کردووە کە ئەویش ویستوویەتی شیری مەمکی دایکی بخوات. ئای، ئۆرێلی نەگبەت، لەبەر ئەوەی منداڵ دەیەوێ خۆی بەسنگی دایکییەوە بچەسپێنێ، ئەمە بەمانای دڵڕەقی نییە. دەنووسی خواوەند (*توانایی هەستەکان و ئەندامەکانی بە لەشی مرۆڤ بەخشیوە، بەجوانترین شێوەی ڕۆناون و هەموو ئەو غەریزانەشی تێدا چاندوون کە ژیان بەردەوام دەکەن و بەرگری لێدەکەن*)[٢٣]. بەڵام تۆ ئەو گوتەیەت بەلاوە شتێکی جوان و چاك نییە. هەر لەسەرەتاوە سەبارەت بە

ابـ[illegible]ونت نارِازی دیاری چونکە لە ناو زوڵمدا بووە و دایکیشت لە گوناهدا رندووتی، یان بەعەشق.

ئەسقەفی مەزن، نوتفەی منداڵ بە ئەڤین دەبەسترێ، پەروەردگاری پایەبەرز کە جیهانی بەو جوانی و ئاوەزەوە خەملاند، رێگەی نەدا هەر لەخۆیەوە گەشە بکا.

تەنانەت لەوەشدا کە مۆنیکا تۆی بە منداڵی تەعمید نەکرد، مانایەکی قووڵتر دەدۆزییەوە: (*چونکە ئەو گەردی گوناهانەی لەپاش تەعمیدکردن لەسەر لەشی مرۆڤ دەنیشن، زۆر رێی تێدەچێ لەگەڵ خۆیاندا کۆسپێکی گەورەتر و مەترسیدارتریان بە دوودا بێ*)[٢٤] گوناه و کۆست ، ئۆرلێ؟. (ئاخر) بۆ چی؟ لەبەر ئەوەی خودا ئێمەی بە نێر و مێ دروستکرد، بەو ژن و مێردانەی کە پێوستی و هەستەکانی خۆیان دەردەبڕن؟ یان ئەگەر بتەوێ، (ئێمەی) بە غەریزە و مەیلە نەفسییەکانەوە (دروستکرد). ئۆرلێ، من ئیدی دەتوانم ئەمەت پێ بڵێم، بەتۆیەك کە رۆژگارێ هاوجێگای مەست و سەرخۆشی من بوویت. تۆیەك، تەنانەت شەیدایی خۆت لە ئاســـت چیرۆکی دیدۆ و ئاینیاسدا (Dido & Aeneas) لە ریـــزی گوناهەکانت دەژمێری.

لە سەرانسەری کتێبەکەتدا بەردەوام ئا بەم شێوەیە سەبارەت بە (مەیلە نەفسانی) و (ئارەزووە گوناهبارییەکان) دەنووسی. ئایا قەت ئەوەت هاتۆتە پێش چاو کە ئەوە تۆیت توانا یەزدانییەکانت بە دزێوی دەبینی؟ لەو بروایەدام تۆقینی تۆ لە دنیای هەستەکان زیاتر لە ژێر کاریگەری مانەوییەکان[٢٥] و ئەفلاتوونییەکاندا بێت، تا لەژێر (کاریگەریی) خودی عیسای مەسیحدا.



لە کتێبی دەیەمدا وەرزیی تۆ نەك هەر جەخت دەکاتەوە سەر دنیای هەستەکان و ئافەریدەی خودایی، بەڵکو لە خودی هەستەکانیش وەرزیت، کە بەدیدی من ئەوانیش هەر دروستکراوی یەزدانن: (*خولیایی هەستی بۆنکردن بەهیچ شێوەیەك لەلای من خۆش نییە. کاتێ هەستی پێناکەم، عەودالّی نیم، ئەگەر هەبێ لە خۆمی دوور ناخەمەوە، وەلێ دەتوانم تاهەتایە بەبێ ئەو هەڵکەم*).[٢٦] وەك ئەوەی تەنانەت پێت شوورەییە خواردنیش بخۆیت چونکە بۆی هەیە پێتخۆش بێ. بەڵام ئەمێستا کە یەزدان فێری کردوویت (*بەهەمان شێوە خۆراك بخۆ کە مرۆڤ دەرمان بەکاردەهێنێ*)، پیرۆزت بێ[٢٧]، هەرچەندە بۆمن تەنێ بیرکردنەوەش لەمە هێڵنجم پێدەدا. نووسیوتە: (تەنانەت ئەو کاتەی بۆ ڕاگرتنی تەندروستیمان خواردن دەخوێن، بەدوویدا هەستێکی مەترسیداری خۆشگوزەرانی داماندەگرێ) لە ئەنجامدا (بەردەوام زانینی ئەوەی ئایا ئەم خۆراکەمان پێوستە بۆ بەردەوامیی ژیان، یان چێژێکی شاراوەیە داوای (خۆراکمان) لێدەکات، کارێکی ئاسان نییە)[٢٨]. وای لە من، وای، ئەسقەف، ئەی ئەگەر شتێ هاوکات هەم بۆ سەلامەتیی جەستە و هەم بۆ خواردن بەسوود بێ، دەڵێی چی؟ من بۆ خۆم دەگەرێمەوە سەر ئەم وشە ساکارانەی هۆراس و ئەو کارەش بە ویژدانێکی ئەوپەڕی ئاسوودەوە دەکەم: (چەنێ ئارامبەخشە جاربەجارێ واز لەخۆمان بهێنین)[٢٩].

ئۆرلێ، پێوستە مرۆڤ بخوات و رێگەشی پێدراوە چێژ لەو خواردنەی دەیخوات، وەربگرێ. ئەرێ خۆ وازت لە خۆشتن نەهێناوە؟ کاتێ چاوت دەکەوێتە سەر گوڵێکی جوان، رەنگە حەز بکەیت برۆیت و بۆنی کەیت، تەنانەت ئەگەر ئەمرۆ ئەو کارەش بە(پێویستیەکی جەستەیی) ناوبەریت، وەلێ بەگوتەی سیسەرۆ (*هیچ قسەیەکی پووچ*

[illegible] فەیلەسووفێ دەرینەبڕیبێ)[٣٠]. دەکرێ بەئاسانی ئەم رستەیە بەسەر [illegible]بیانی کەنیسەشدا بسەپێنین.

ئەو ڕۆژەت لەبیرە کەپێکەوە لەسەر پردی ڕووباری (ئارنۆ) پیاسەمان دەکرد؟ لەکاتێ ڕۆیشتنندا لەپڕ وەستایت چونکە حەزت لەوەبوو بۆن بە پرچمەوە بکەیت. بۆچی حەزت لەوە بوو، ئۆڕلێ؟ ئایا ئەوە هاوارێکی جەستەیی بوو جارێکی دی خۆی بەرجەستە کردبۆوە؟ لەو بڕوایەدا نیم، نەخێر، بڕوام وایە ئەتۆ سەردەمانێ مانای واقیعیانەی ئەڤینت دەزانی، وەلێ بەداخەوە (ئێستاکێ) لەبیرت چۆتەوە.

لەکتێبی دووەمدا، سەبارەت بەساڵانی نەوجەوانیت لە (تاگاستە) نووسیوتە، زەمانێ بوو کە (ڕۆحت بە گوناهە جەستەییەکان ئالوودە ببوو)[٣١].

نووسیوتە: (شتێ کە زۆرترین چێژی بەمن دەبەخشی (ئەوە بوو) خۆشتبوێن و خۆشیان بوێی.. وەلێ لە لیتاوی سەرنجڕاکێشەری جەستەیی و لە سەرچاوەی ئارەزووەکانی لاوێتییەوە، هەڵمێکی تەماوی هەستا و بەجۆرێ دڵی منی بردە ناو ڕەشایی و تەم ومژەوە کە چیدی نەمدەتوانی جیاوازی لە نێوان ئەڤینی پاکژ و ئارەزووی ناپاکدا، بکەم. لە دەروونمدا هەرتك ئەو هەستانە هەبوون و خرۆشابوون، خیانەتکارانە ئاوێزانی یەکدی دەبوون و منیان، منداڵێکی خوونەگرتوویان راپێچ دەکردە ناو کەندرێ شەڕوشۆڕەکانەوە و بەردەوامیش دەیهاویشتمە ناو لافاوێکی گەورەی خەسڵەتە دزێو و ناپەسندەکانەوە)[٣٢]. ئۆڕلێ، بەمەزندەی من برێ زیادەڕۆیی دەکەی.

بێگومان تۆش وەکو هەر کوڕێکی گەنجی تر خاوەنی ئەزموونی زیندووی خۆت بووی، وەلێ ساڵانێ لەوە پاش کەمن تۆم بینی، هاوسەرینەکەی من کوڕێکی لاوی بێ



ئەزموون و دەست و پێ سپی بوو. هەروەها بەردەوام دەبیت و دەڵێی، بەو ڕێژەیەی هاوڕێکانت بانگەشەیان دەکرد، کە گوایە ئەزموونیان هەیە، ئەزموونت نەبوو، شەرمن بوویت. نووسیوتە ئەوان سەربڵندانە باسی (خەسڵەتە ناپەسەندەکان)یان دەکرد و بۆ خۆشت لە پاشاندا هەمان ئەو کارەت کرد. وایە، ئەمکارانە منداڵانەن، قەبووڵم نییە؟ بەڵام شەرماوی؟ ڕەنگە شەرمەزارترین شتەکان ئەوە بێ کە ئەسقەفی هیپۆرگیۆس هێشتاکەش زەینی سەرقاڵ بێت بەو شتە منداڵانەوە. ئاخر نابێت ئەسقەفێك سەری لەحاڵەتە مرۆییەکان سووڕمێنێ[٣٣]، کوڕێژگەکان هەرچی بێت منداڵن، ئەوەتەی هەبووە هەروا بووە. تەنانەت لە بەیادهێنانەوەی ئەو (تاوانە ترسێنەرەی) لەساڵی شازدەهەمی تەمەنی خۆتدا لەگەڵ چەند هەرزەکارێکی تردا کردتان، شەرم ناکەیت: لێکردنەوە و دزینی چەند هەرمێیەك [٣٤].

ئیدی لەوەپاش و لەنکاو زۆر عەبووس و قورس دەبی. لە سەرەتادا ئاماژە بەگوتەکانی (پۆڵس) ی ڕاسپێردراو دەکەی کە گوتوویەتی: (باشتر وایە پیاو دەست لە ژنێکەوە نەدات)[٣٥]، ئەرێ بەڕاست ئۆڕلێی ئازیز، بۆچی هەرتەنیا ئەو ڕستەیە دەهێنیتەوە. تۆبڵێی ئەمە ئەو شتە نەبێ کە لەمانەویەکانەوە فێری بوویت؟ ئایا لە دەرسی زانستی بەیاندا فێریان نەکردوویت جیاکردنەوەی ڕستەیەك لە سیاقی خۆی چەند مەترسیدارە؟ ئەوە ڕاستە پۆڵس نووسیویە وا باشترە بۆ پیاو دەست لە ژنێکەوە نەدات، وەلێ ئەو لەدرێژەی گوتەکانیدا ئەوەش زیاد دەکات و دەڵێ بۆ خۆبەدوورگرتن لە بێ پەروایی دەبێت هەر پیاوێ هاوسەری خۆی هەبێ و هەر ژنێکش مێردی خۆی. کەمەکێ لەوە دواش جەخت دەکاتەوە سەر ئەوەی کە پێوستە ژن و مێرد وەك جەستەیەك وابن و بەردەوام ئاوێزانی یەکتربن نەبەڵکا بیر لە خیانەت بکەنەوە، چونکە ناتوانن بەردەوامی بە داوێنپاکی خۆیان بدەن[٣٦]. ئەو پرسیارەی دەخرێتە ڕوو

بە[illegible] ئایا ڕەوایە بەهۆی خۆپاریزی و داوێنپاکییەوە (خەسڵەتە ناپەسەندەکان) [illegible]ڕکوت بکەین. ئەگەر لەمن دەپرسی بیر لەپێچەوانەکەی دەکەمەوە. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە تۆ لە هاوتەمەنەکانت زیاتر گیرۆدەی ئەمجۆرە بیروڕایانەیت، ئەمە لەگەڵ ئەوەشدا لەو سەردەمەوە کە تۆ خۆت هاویشتۆتە ناو باوەشی دایکێکی داوێنپاکەوە، پازدە ساڵ ڕادەبووری. هەڵبەتە بەداخەوە، تێکشکانێکی گەورەشت بەسەرداهات. هۆراس دەنووسێ ئەگەر بەچەومالەش سرووشتی (مرۆڤ) ڕامالێن، هەر دێتەوە[٣٧] مەگەر لەگەڵیدا بەتووندیی و خێرایی بجوولێتەوە. فەرموو، ئەوەتا نووسیوتە: چاتر بوو لەلاوێتیدا و لەپێناوی مەلەکووتی بالادا خۆمم خەساندبا[٣٨]، لەو حاڵەتەشدا چ لەوە باشتر بوو بە خەیالێکی ئاسوودە ترەوە چاوەڕوانی گەیشتن بە مەلەکووتی بالات کردبا. ئۆرلی بێچارە، چەنێ لە پیاو بوون شەرم دەکەی، تۆیەك کە ئەسپە بچکۆلەکەی من بوویت و لەگەڵ ئەوەشدا ئێستێ ئەوەش ساڵەهای ساڵە دوای ئەوەی پاکداوێنی و ڕۆحانییەتت وەك بووکی خۆت هەڵبژاردوون، دێیت و دڵی خۆت بۆ یەزدان هەڵدەڕێژی و دەبێژی دڵت بۆ ژنێ لەپالتا تەنگ بووە. ئەسقەف، لەکتێبی دەیەمدا نووسیوتە: (بەڵام لەیادوەریمدا هێشتاکەش شتگەلێ کە تا ئەو ڕادەیە قسەم لەبارەیانەوە کرد، (شتگەلێ) لە خووەکانی ڕابردوو، بە وێنەی چەسپیو ماونەتەوە. ئەمانە خۆیان بەسەر مندا دەسەپێنن، ئەگەرچی لەکاتی بێداریمدا ئەوەندەش ڕوون نین، بەڵام لەخەودا وەسواسم دەکەن، ئەمەش نە تەنیا بۆ چێژ وەرگرتن، بەلکو بۆ ئەوەی قەبوولێان بکەم و کاریان پێبکەم)[٣٩].

لە ناواخنی ئەم قسانەوە ئەو ئەنجامە وەردەگرم هێشتاکەش خۆتت نەخەساندووە. پێشدەچێت جاروبار ئارەزووی من بکەیت؟ ڕەنگە ئەوە یادوەرییەکانی من و هەندێ لە (خووەکان)ی ڕابردوون کە لە خەونتدا دەیانبینی؟ بۆچی ئۆرلی، ئەتۆ بەراست قەت



(ئەو کارەت) نەکردووە؟ تۆیەك کە هاوجێگای من بوویت. ئایا باشتر نەبوو چاوی خۆت دەربێنی؟ هەر بەو جۆرەی ئۆدیب کردی؟[٤٠]. بۆچی نەتدەتوانی زمانی خۆت ببڕی؟ باش دەزانم کە دڵت لە بۆ ماچەکانی من تەنگ بووە..

وابیردەکەمەوە ئەگەر واز بهێنین لەهەموو ئەو قسانەی کردمانن، ئەوە سێکس بەلای تۆوە شتێ بوو لەبابەتی ئەندامە هەستیارەکان. ئۆرلێ، مەگەر وانییە؟ بەهەرحاڵ، ئەوە تۆیت بەردەوام سەبارەت بە (مەیلە نەفسییەکان) دەنووسی، ئەمە لەکاتێکدا ئەوەی دەنێو سەرتدایە لە واقیعدا چێژەکانی ئەڤینە. ڕەنگە بڕواشت کردبێ کەچاوەکان و گوێیەکانت زیاتر دەستکردی یەزدانن تا ئەندامی جنسیت؟ ئەرێ بەڕاست وابیردەکەیەوە کە هەندێ لە ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ لەچاو هەندێکی تریاندا کەمتر یەزدانین؟

# سیپارەی سێیەم

لەکتێبی سێیەمدا سەبارەت بەو کاتە نووسیوتە کە وەك قوتابییەکی لاو هاتیتە قەرتاجنە.

*(سەوداسەرییەکی مەترسیداری هەوەسبازانە لەهەر چوار لاوە دەوری دابووم، وەك قابلەمەی کوولْهاتووی جادووگەرێ. هێشتاکە عاشق نەببووم، وەلێ لە تامەزرۆیی ئەڤیندا دەسووتام. ئارەزووەکانم شاردنەوە و تووڕەبووم لەخۆم کە ئەوەندە حەزم هەیە. لە ئەنجامی پێویستییەکی زۆر بە خۆشەویستی کەوتمە عەودالْبوون بەدووی شتێکدا تابتوانم ئەڤینداری بم)*[٤١].

ئەو کاتە منت دۆزییەوە، هێشتاکە سالێ بەسەر مانەوەتدا لەو شارە تێپەڕی نەکردبوو کە یەکترمان بینی، من هەر لەوێ لەدایك ببووم. هەردووکمان نۆزدە سالاْن بووین. لەبیرمە لەگەلْ دووسێ قوتابیدا دە ژێر دارهەنجیرێکدا ڕۆنیشتبووم. بەرلەوە تۆ لەگەلْ یەکێکیاندا ئاشنایەتیت هەبوو و بەرەو ڕوومان هاتی. من لەو دەمەیدا کە تیشکی خۆر لەچاوانم چەقیبوو و سەرم داخستبوو، ملم هەلْبڕی و تەماشای تۆم کرد. پێدەچێ ئەو کارەم بەجۆرێ کردبێ کە سەرنجی تۆم ڕاکێشا، چونکێ چاوت لە چاوم بڕی، ئەوکاتەش یەك دوو جار بێموبالاتانە تەماشای عەردەکەت کرد و دیسانەوە ڕوانیتە چاوەکانم. بۆ ئەوە دەچوو هەردووکمان هەستمانکردبێ تەمەنێکە پێکەوە دەژین. من هەر لەوێدا لێم مەعلووم بوو کە دەتوانم بەهەموو ڕۆح و دلْمەوە خۆشمبوێی و ئاوێزانت



بم. لەگەلْ ئەوەشدا نە ترسم هەبوو نە بەخەونیش دەمبینی کە هەمان شەو ئەو ڕووداوە ڕوویدات. وێدەچێ ئەگەر بەڕاستی درکم کردبێ، ئامادەیی هەردوو ئەو کارەم هەبوو.

ئەوەی کەمن لەگەلْ دەستەیەك قوتابیدا بووم، خۆی لە خۆیدا شتێکی سەرسوڕهێنەر نەبوو. وەلێ تۆ بەسەرسووڕمانەوە لەوە تێگەیشتی کە منیش وەك هەریەکێ لەوان لە گفتوگۆکاندا بەشداری دەکەم. هەر کە هەردووکیشمان بەتەنێ ماینەوە، یەکێ لەو شتانەی لەبارەیەوە دوایین، ئەمەبوو. لەگەلْ قوتابییەکاندا سەرەتا لەبارەی ڤیرژیل (Vergil)وە دوایین و پاشانیش سەبارەت بە ئەڤین و ژیان بەشێوەیەکی گشتی. لەبیرمە بەکەمێ واق وڕمانەوە سەرنجتدا چەندێ بەئاسانی بەرگریم لە کاری دیدۆ سەبارەت بە خۆشەویستی کرد[٤٢]. وەك ئەوەی بە نیگا لەمنت دەپرسی ئایا بەڕاستی ئافرەتێ هەیە ئەوەندە عاشقی پیاوێ ببێ تا لە کاتی خیانەتکردنی پیاوەکەدا، خۆی بکوژێت.

نازانم لەبەر ئەوەی سەبارەت بە دیدۆ و ئاینیاس قسەمان دەکرد، تۆ لە نکاو لێت پرسیم ئایا تا ئێستێ چووم بۆ ڕۆما، یان شتێکی دیکەی لەو بابەتە. بەهەرحالْ، بەلای منەوە پرسیارێکی سەیربوو، زۆریش سەیر، چونکە ئێمە هێشتا یەکترمان نەدەناسی، کەچی تۆ دەتویست بزانی ئایا تا ئێستا من چووم بۆ ڕۆما یان نەء. وابزانم وا تێگەیشتم کە دەتەوێ سەری قسانم لەگەلْ دابمەزرێنی، چونکێ یەکسەر دوای ئەوە گوتت کە بۆخۆشت هەتا ئێستا ڕۆمات نەدیوە، وەلێ مەبستمە ڕۆژێ بچیت. لەبەر ئەوەش کە کەمێ پێشتر لەبارەی دیدۆوە دەدواین، وەك ئەوە وابوو منت خستبێتە شوێنی شاژنی قەرتاجنە کە ئەوەتا لەوێدا دانیشتووە و لەبەر ئەوەش ئەمن بەگەرمی بەرگریم لەو شاژنە ئەفسانەییە کردبوو، وەك ئەوەی بتەوێ وای پیشاندەیت ئەگەر من هی تۆ دەبووم پێکەوە دەچووینە ڕۆما و ئەگەریش بچووینایە هەرگیز ڕێگەت نەدەدا هەمان ئەو چارەنووسە دەردەدارانەیەی ئەوم هەبێ. ئەو کاتە نەمدەزانی کە سالْەها لەوەدوا ئێمە هەرتکمان بەڕاستی دەچین بۆ رۆما. وەلێ وەك ئەوەی خۆپێچانەوەی ئاینیاس بۆ ڕۆیشتن لە قەرتاجنە، سەرەتای هەموو شتێ بوو، پێدەچێ (باش بێ) ئەوەش بخەمە سەری و



بەڵام هەر لەوێشدا هەموو شتێ کۆتایی هات. تۆش بەوێنەی ئاینیاس پەیامێکت بوو گرنگتر بوو لە ئەڤینی قەرتاجنە.

دواجار من و تۆ بەتەنیا لەژێر دارهەنجیرەکەدا ماینەوە. لەو بڕوایەم هەر لەو ساتەدا و لەهەمان شوێندا شتێ لەسەر ئێمە دروستبوو کە بەجۆرێ ئەوانیتری ترساند، شتێکی پتەو و نزیك، وەك ئەوەی ئێمە دوو پیلانگێڕی نادیار بووین. ئەوسا لەگەڵمدا هاتییەوە ژوورە بچکۆلەکەم و شەو لەێ مایتەوە. هەژدە مانگ لەوەدوا خاوەند کوڕێکی پێبەخشین و تازە ئێمە لێکدی هەڵنەدەبڕاین تا ئەو کاتەی مۆنیکا، یان داوێنپاکی، ئێمەی لەیەکدی هەڵاوێرد و هەرتکمانی بە برینی خوێنەڕۆوە بەجێهێشت.

هەر لەو سەرەتایەڕا ژیانی ئێمە بەتوندی لەسەر هەستەوەرییەکی قووڵ دامەزرابوو، چونکە بەجووتە ڤینۆسمان خۆشدەویست و جاری واش هەبوو هەردووکمان وەك یەك تامەزرۆ بووین. وەلێ ئەمێستاکێ کە یادەوەرییەکانت دەخوێنمەوە، خەمێ دامدەگرێ چونکە دەبینم ئەوەی تۆ لەوێدا بە (هەوای نەفس) ناوی دەبەی، تەنیا شتێ بوو ئێمەی پێکەوە گرێدەدا. وا دێتە پێش چاو لەئاست ئەوەی لەلاوێتیدا روویداوە بەتووڕەیی و دەمارگرژییەکی بێسنوورەوە لۆمەی خۆت دەکەیت و ژێوانی. هەروەها ژێوانیشی لەبۆ هەموو ئەو رۆژانەی لەپێش پاکژبوونەوە و داوێنپاکییەکەتدا تێتپەڕاندن. ئەرێ بەراست ئەمە ترسە لە خودای پایەبڵند، یانەخۆ پەلەقاژەیە بۆ خۆ رزگارکردن لە دوودڵی و لۆمەکردنەکانی خۆت؟

کێ نالێ ئەوە رێك و راست هاوڕێیەتی قووڵی مەیە کە تۆی ئاوا شەرمەزار کردووە. پیاوگەلێکی زۆرهەن بەلایانەوە نەنگترە هاوڕێیەتی ئافرەتێ بکەن وەك لەوەی جڵەوی خۆیان شل بکەن بۆ گرتنی دۆستایەتییەکی تایبەتی لەگەڵیدا. لەو بارەدا هەردەم دەکارن پەنا بۆ ئەو پاساوە ببەن کە هەبوونی دۆستایەتییەکی تایبەتی رێگر بووە لەبەردەم هاوڕێیەتییەکی راستگۆیانەدا. بەداخەوە هەر چەندێ زیاتریش بە



فەلسەفەزانی دەڕازێنەوە، ئەم راستییە بەرجەستەتر دەبێ، ئەمن بەشێکی زۆری ئەمەش دەگێڕمەوە بۆ مانەوی و ئەفلاتوونییەکان.. بەگریمانەی خۆم ئەتۆ دوای خوێندنەوەی فایدۆن[٤٣] بەجۆرێکی دی لەمنت روانی و خوێندنەوەی فۆرفۆریۆسیش[٤٤] یارمەتییەکی زۆری مەسەلەکەی نەدا. ئاخ ئۆرێڵ، ئەو هەموو راوێژکار و ئەم هەموو روانگەیە[٤٥]. وەلێ من تا ئەو کاتەی بەناوی (حەوا)وە بانگت نەکردبووم، لەو دەردە سەرییە ئاگادار نەبووم و ئەمەش تا ئەو دەمەی نەچووبووینە میلانۆ، روونەدابوو. سەردەمانێ بوو هەرچیت لە دەست هاتبا دەتکرد تا بچییە نێو بازنەی دەوروبەرەکانی ئمبرۆسیۆسەوە.

نووسیوتە لەو دەمانەدا رۆحت پتەو و ئاسایی نەبوو (سەراپا بە ئاوڵە داپۆشراو خۆی دایە دەستی هیلاکی و لەبۆ کەمکردنەوەی خرووەکەیشی پەنای بردە بەر چێژە جەستەییەکان. وەلێ هیچکام لەمانەش بەبێ رۆح نەدەبوون، چونکە (ئەگەر وابوایە) ئەمن شەیدایان نەدەبووم. هەستمدەکرد چ چێژێکی هەیە خۆشەویستی و خۆشەویستبوون، بەتایبەتی ئەو کاتانەی دەمتوانی ببمە خاوەنی جەستەی مەعشوق و هەر ئا بەو جۆرەش بوو کە کانییە قووڵەکانی هاوڕێیەتیم بەهۆی ئارەزووە شەهوانییەکانەوە شێلوو کردن و درەوشانەوە شووشەییەکەیان بەهۆی وەسواسە دۆزەخییەکانەوە تاریك بوو)[٤٧].

کەواتە، نایشاریتەوە کە ئێستێ چەندە و بەچ هێزێکەوە رقت لە ڤینۆس دەبێتەوە. ئەوەیش، ئۆرێڵ، کە بۆ خۆی ببووە پردی زێڕینی رۆحە تەنیا و تۆقیوەکانمان. هەر بەوەش تەواو نابێ، تۆ ئێستا بێزاریت لەهەموو چێژێکی جەستەیی، لەوەش زیاتر و ئەولاتر ... لەدریژەی (قسەکانتدا) بانگەشەی ئەوەی دەکەی کەئیدی لەخودی هەستەکانیش تووڕەیت، لەراستیدا ئەتۆ ناچار بوویت.

ڕاستی تێناگەم چۆن دەتوانی ئاوا بەسادەیی نهێنییەکانمان بە تۆمەتی (ئارەزووی هەوانی) یان (چێژە جەستەییەکان) فڕێدەیتە لاوە. باشە بەلای کەمەوە تا کتێبی دەیەمم نەخوێندبۆوە لەوە تێنەدەگەیشتم کە ئیدی نەك هەر رقت لەگشت هەستەکانە، بەڵکو رقیشت لەهەمموو ئەو شتانەیە کە میوە و شەراب لەبۆ رۆحی ئێمەی دابین دەکەن. وەلێ ئەمەش هەمموو بەسەرهاتەکە نییە. لەوێوە دەستپێدەکەی مننەت بەسەر یەزداندا بکەی چونکە تێگەیشتوویت لەوەی چەندە لە دروستکراوەکانی تووڕەیت. پاشانیش دەڵێی، هەمموو ئەمەش بەو بەڵگەیەی کە بەنیگای گیانت (نوور)ێکت دیتووە.

هەرچۆنی بێ من ناتوانم وەلاّم حازری و دەست و پەنجەی بەتوانات لەبیر بکەم. دەبینم کەرێگای خۆت لەنێو قوتابیەکانی خوداناسیی مەسیحیدا گومکردووە. ئەوە چ پیشەیەکی ماندووکەرە. چۆنە ژێردەستەکان دەتوانن فەرمانڕەوایی بەسەر گەورەکانەوە بکەن؟ چۆن دەبێ بەرهەم نووسەرەکەی پێناسە بکا؟ ئەرێ لەڕاستیدا چۆن چۆنی خودی بەرهەم یەکسەر دەبێتە هۆی ئەوەی کارکردی خۆی نەهێڵێ؟

ئۆرڵ، ئێمە وەك مرۆڤ ئافەریدەبووین و لەشێوەی مێ و نێریشدا هاتووینە بوون. سیسەرۆ لە نووسینەکەیدا لەبارەی تەمەن و ساڵەکانەوە شتێ دەڵێ (من تەنیا ماناکەی دەگوێزمەوە) لەبابەت ئەوەی ئامادە نییە گەنجێتی خۆی بەهەمموو هێز و توانای شێر و فیل بگۆڕێتەوە. نابێت ئێمە بەوجۆرە بژین کە نین، چونکێ ئایا لەو حاڵەتەدا گاڵتەجاڕیمان بەخودا نەکردووە؟ ئۆرڵ ئێمە مرۆین، پێوستە یەکەمجار بژین و دوای ئەوە، بەڵێ ئەو کاتە دەتوانین بفەلسەفێنین[٤٨].

ئایا من جگە لەجەستەی ئافرەتێ شتێکی تر نەبووم بۆتۆ؟ بۆ خۆت دەزانیت کە ئەمە ڕاست نییە. چۆن دەتوانی لەنێوان جەستە و رۆحدا جیاوازی بکەیت. ئایا ئەمە بە دەستێوەردان لەکاری یەزدان ناژمێردرێ؟ ئۆف، بەڵێ پلنگە سپڵەکەم، بێگومان



وادەژمێردرێ. ئەو دەمەی جەستەی من لە نێوان پەنجەکانتا بوو بەدووی رۆحمدا دەگەڕایت.

هاوڕێیەتی، بە جوانییەکی بێوێنە لە کتێبی چوارەمدا وەسفی دەکەی، هەڵبەتە مەبەستت لە هەڤاڵێتی ئەو پیاوانەیە کە لە زەینتدان: (پێکەوە دەپەیڤین و دەکەنین و هەمموو لە خزمەتی یەکتردا بووین. گاهێ کتێبە باشەکانمان دەخوێندنەوە، گاهێ گاڵتەمان لەگەڵ یەکترا دەکرد و جاری واش هەبوو دەکەوتینە مشتومڕوگفتوگۆ. بەدەگمەن جیاوازیی بیروڕا دەکەوتە نێوانمانەوە، وەلێ لەیەکدی تووڕە نەدەبووین، زۆرترین کات لەوە دەچوو مرۆ لەگەڵ خۆیدا کەوبێتە ناکۆکییەوە. ئەمجۆرە ناکۆکییانە وەك تام و (مەزە)ی ئەو گونجانە دەهاتە پێش چاو کە بەسەر دەستەکەماندا باڵێکێشا بوو. یەکترمان فێردەکرد و لەیەکدییەوە فێردەبووین. هەرکاتێ یەکێ لەمە ئامادە نەبووبا، چاو لەڕێی بووین، جاری وا هەبوو بەدڵی پڕ دەردەوە و هاتنەوەکەشیمان مەستانە پێشوازی دەکرد. بەم رەفتارە و بەهۆی نیشانەگەلی لەمجۆرەوە، بۆی هەیە ئەڤین لەنێوان هەڤاڵ و دۆستاندا لەدڵێکەوە بچێتە دڵێکی ترەوە، (ئەویش) لەڕێگەی جووڵەی سیما، قسەکان، روانین و هەزاران رەفتاری دۆستانەی دییەوە، کە وەك جورعەکانی رۆح ئاگری تێبەردەدابن و زۆرایەتی دەگۆڕی بۆ یەکایەتی.)[٤٩].

کاتێ ئەم دەربڕینانەم خوێندنەوە وام هەستکرد قووتدراوم یان باشترە بڵێم: هاوکات قووتدرام و هەرلەوێش برینداربووم. ئایا ئەم قسانە بەیەکسانی بۆ هاوڕێیەتی ئێمەش بەکار نەدەهاتن؟ ئێمەش لەگەڵ یەکدا دەمانڕێسا و دەکەنین و هەردووك هەڤاڵ و یاوەری یەکتربووین، هەر لە سپیدەوە تا زەردەپەر. ئەوە ئێمە بووین نیشانەگەلێکی نهێنیمان بۆ یەکتر دەنارد (لە دڵێکەوە بۆ دڵێ، بەهۆی جووڵەی سیما، پەیڤەکان، دزەنیگا و هەزاران رەفتاری دۆستانەی دیکەوە). ئێستا لەوە دەچێ وەك بڵێی باشترین شتە هاوبەشەکانی خۆمانت هێناون و بوێرانە لەیادەوەری خۆتدا پاراستووتن، ئەویش لەشێوەیەکی گۆشەگیرانەی هاوڕێیەتیدا کە لەنێو پیاوەکاندا (باوە). وەختێ لەژێر هۆ و

ی زنجیرەدا رووبەڕووی یەکتر بووینەوە ئەوەندە چەپەڵ و دەستپیس نەبوویت. بێگومان ئەو دەمەش هاوڕێگەلێکی زۆرت هەبوون، زۆر بێ ئەژمار. وەلێ ئەو کەفینەی دەنێوان ئێمەدا بوو جۆرێکی دی بوو، هەرلەبەر ئەوەش قەتاوقەت حەسوودیم بە هەڤاڵە نێرینەکانت نەدەبرد. لەنێوان مەدا برووسکەیەك هەستا کە نە تەنیا رۆحمانی ئاور تێبەردا، بەڵکو جەستەشمانی سووتاند.

درێغی ناکەیت لە گازەندەکردنی ئەڤینی جەستەیی نێوانمان، با وابێ، ئەگەرچی تەنانەت لەبیریشت چووە کە من لە هەمان کاتدا باشترین هاوڕێشت بووم. پێدەچێ لە ئاست دروستکردنی پەیوەندییەکی هاوڕێیانەدا لەگەڵ ئافرەتێ بەقووڵایی زەلکاوێکدا رۆچوو بیت. ئاخر خۆمن هەرتەنیا گۆشت و خوێن نەبووم[٥٠] کەواتە گەورەترین تاوانی تۆ[٥١] ئەوە نەبوو کەجەستەی ئافرەتێکت خۆشدەویست، چونکە بەو پێیە نە لە ئەوانیتر باشتر بوویت و نەخراپتریش. گوناهی[٥٢] نەبەخشراوی تۆ ئەوەبوو تەنانەت دڵێشت بە رۆحی حەواوە بوو.

ئەگەر بەخۆت ئاوا شێلگیرانە پەنات بۆ قاپیی خودا نەدەبرد تا دڵت بکاتەوە، پێویستی بەوە نەدەکرد من بەوێ مەسەلە لەیادچووەکانت بەبیر بهێنمەوە، چون ئیدی ماوەیەکی زۆر بەسەر ئەو زەمانەیە تێپەڕیوە کەمن و تۆ بازووەکانمان لەیەکدی دەئالاند. وەلێ بەوە دەچێ رێگەت دابێ بۆ ئەوەی واقیعیەت وەك گیانەوەرێکی دڕندە بە دانپیانانەکانتدا هەڵشاخێ. ئۆرڵ، لێگەڕێ با هەڵشاخێ، لێگەڕێ تا هەواری مەبەست و بەرووی مندا هەڵشاخێ. لێرەکانە ئارام دەبێتەوە، چونکە من تەنیا کەسێکم ئاگاداری واقیعیەتەکەم.

هەردەبێ خودایەك هەبێ ئێمە بناسێ. ئەگەر وایە، ئەوە گومانم نییە لەوەی هەمموو ئەو چاکەیەی لەگەڵ یەکمان کردووە، لەشوێنێکدا پاراستوویەتی. زمانیشم لاڵ، ئەگەر نەشبێ، ئەی رۆحی هاوژینم، ئەوە لەهەموو جیهاندا هیچ کەسێ نیە هێندەی ئێمە



یەکتر بناسێ. چونکە هەر بەو جۆرەی رۆح و جەستەی خۆت بەمن بەخشی، منیش ئاوا رۆح و جەستەی خۆم لەسەر تۆ وەقف کرد. تۆ لەهەر جێیەك ئامادەبییت هەبوو، منیش لەوێ بووم و لەهەر کوێیەکیش هەبووبم، دەتویست لەوێ ئامادەبیت[٥٣]. پاشان، لە هەووەڵەوە دایکێ دەنێوان مەدا پەیدابوو، ئەمجا مانەوییەکان و پاشانیش ئەفلاتوونییەکان و لەدوای ئەمانەش تۆ یەزداننناسی مەسیحایی و داوێنپاکیت کردە پەردەی نێوانمان. ئابەمجۆرەش تۆ مەودایەکی زۆر زیاتر لەمن دوور کەوتیتەوە لەچاو ئەو مەودایەدا کە ئاینیاس بۆ دوورکەوتنەوە لە دیدۆ بڕیبووی. بەشکم پەروەردگار بە لوتفی خۆی هەڵەکانت ببەخشێ.

ئایا من و تۆ دوو نیوەی جەستەیەك نەبووین کەپێکەوە بەسترابووین، بەهەمان ئەو جۆرەی کەپردێ هەردوو بەری روبارێ دەکاتە جەستەیەکی تاقانە؟ پاشانیش، خودایەکی دەسەڵاتدار لە رووبارەکەوە دێتە دەرێ- یان بنەما رووتەکەی داوێنپاکی- کەوا دێتە پێش چاو بڕیاری بەستنەوەی بەرێکی رووبارەکەی بە بەرەکەی تریەوە، لە دەستدایە. ئەمن، هەرگیز بڕوام بە خودایەکی ئەوتۆ نییە، قوربان. ئەمە ئەو خاڵەیە کە من بە دووروودرێژی لەگەڵ قەشەی قەرتاجنەدا باسمکردووە. هەڵبەت ئەو دەزانێ رۆژگارێ دەگەڵ پیاوێکدا ژیاوم، وەلێ نازانێ ئەو پیاوە تۆیت، بەم پێیەش، ئایا ئەو کاتەی بەیانییەك ئەو بە کتێبی ***دانپیانانەکانی*** تۆوە هاتە سەردانی من، ئەمە لەدیمەنی تراژیدییەك نەدەچوو؟ نەکا بۆ خۆت ڕاتسپاردبێ (ئەو کارە بکا)؟!

ئەرێ دێتەوە بیرت بەرلەوەی خونچەکان بپشکوون، چۆن نەوازشت دەکردن؟ چۆن لە چنینی من چێژت وەردەگرت؟ چۆن بۆنی منت بە کەپووی گیان هەڵدەمژی؟ و خۆراکت لە بوونی من وەردەگرت؟ پاشانیش جێتهێشتم و منت فرۆشت لەبەهای رزگارکردنی رۆحتدا. درێغا لە دەست ئەم سپڵەیی و بێوەفاییە، ئەوە چ گوناهێ بوو، ئۆرڵی ئازیز.. نەخێر، من باوەڕم بەو خودایە نییە کە قوربانیی لە مرۆڤ دەوێ. من ئیمانم بەو خودایە نییە کە ژیانی ئافرەتێ بەرباد ئەکا بۆ ئەوەی رۆحی پیاوێ رزگار بکا.

## سیپارەی چوارەم

کەمێ لەوە دوا لەگەڵ کوڕە چکۆلەکەمان کە دوو ساڵان بوو، چووین بۆ (تاگاستە)ی شوێنی لەدایکبوونی تۆ، بۆ هەمان ئەو شوێنەی کە زانستی بەیانت لێخوێند. لە کۆتایی کتێبی سێیەمدا نووسیوتە: (دوور لەبەڵا، من لێرەدا چەند بەشێ لادەبەم، چونکە بەپەلەم هەرچی زووترە بگەمە ئەو خاڵانەی بۆ دانپیاهێنان لەبەردەمی تۆدا گرنگترن. لە هەمان کاتیشدا چشتگەلێکی زۆرم لەبیرچوونەوە)[٥٤]. وەلێ نابێ لەبیرت چووبێ چەندە بەلای مۆنیکاوە زەحمەت بوو تۆ و ئادێوداتۆسی بچکۆلە و من لەماڵەکەی ئەودا بژین. هەر ئەو دەمە بوو من هەستمکرد ئەو داوەی پەیوەندیی تۆ و مۆنیکا پێکەوە دەبەستێ، شتێکی ترە لەوەی پەیوەستبوونی دایك و کوڕ پێکەوە گرێدەدا. دەزانی، من سەبارەت بە خەونەکانی مۆنیکا تێگەیشتنی خۆمم هەبوو. خەونێکی دیتبوو (تیایدا): (لەسەر لقی درەختێ وێستاوە و پیاوێکی گەنج بەرەولای دێ، پیاوێ لێوانلێوە لە تیشك و ڕۆشنایی، بۆی پێدەکەنێ، ئەمەش لەکاتێکدا مۆنیکا بەخەمبارییەوە لەوێدا وێستاوە. پیاوە گەنجەکە لێی دەپرسێ بۆچی خەمبارە و ڕۆژانە ڕووندکان دەڕێژێ. پیاوە ئاوایکرد، بەو جۆرەی لەخەونەکاندا ڕوودەدا، مەبەستی پرسیارکردنی نەبوو، بەڵکو دەیویست شتێ پیشان بدات. مۆنیکا وەڵامی دەداتەوە لەبەرئەوەی خەمبارە چوون کوڕەکەیگوم بووە. پاشان پیاوە گەنجەکە داوای



لێکرد خەمبار نەبێ و تەماشای دەوروبەری خۆی بکا، ئەو دەمە بۆی دەردەکەوێ ئەو لە هەر شوێنی بێت کوڕەکەیشی لەوێیە[٥٥]. ئیدی مۆنیکا لەسەرێی نۆڕی و منی بینی کەبەسەر لقێکەوە وێستاوم)[٥٦]. ئۆڕێڵ، تۆ بەجۆرێ ئەم خەونە دەگێڕییەوە، وەك ئەوەی مەسەلەکە لە زەینی تۆدا ڕوونتر دیارە: (لەهەر شوێنێ تۆ هەیت، ئەویش هەیە)[٥٧] کەواتە تۆ و مۆنیکا، دایك وکوڕ بەسەر لقی دارێکەوەن. ڕەنگبێ لێرەدا ئاماژەیەکی شاراوەی بۆ ئایین تێدابێ، هەرچەندە ئێستێ وا دەردەکەوێ شتی زیاتری تێدا ببینی. ئەدی ڕێسا بەو جۆرە نییە کە پیاو دایك و بابی جێبهێڵێ و ژنێ هەڵبژێرێ و دوو کەسەکە ببنە گیانێ لەدوو جەستەدا؟ وەلێ ئەو خۆی کردە پەرژینی نێوانمان و هەر ئەویش بوو لە ئەنجامدا ململانێی نێوان ئەم دوو کەسەی بردەوە. بەبێ دوو دڵی ئافرەتێکی بەهێز بوو، لەگەڵ ئەو هەموو پێگەخوازییەی بۆ خۆی و کوڕەکەی (داوایدەکرد).

وەلێ بهێڵە کەمێ بەرەو پێشتر بکشێین، بۆ کتێبی نۆیەم. لەوێدا، لەدەمی ماتەمگێڕیتدا، کاتێ مۆنیکا لە (ئۆستیا) مرد، نووسیوتە: (وەك بڵێی هەموو ژیانم شەقارشەقار بوو، چونکێ ژیانی من و ئەو ببووە یەك خودی بێ نموونە)[٥٨].

ئۆڕێڵ، ئەرێ بەڕاست، شەرمێ لەخۆت ناکەی؟ دەڵێی ئۆدیب و ژۆکاستەت بەتەواوی بیرچوونەوە؟[٥٩] چاکە، ئۆدیب چاوی خۆی دەرهێنان و تۆش ئاواتت ئەوە بوو بتتوانیبا خۆت بخەسێنی، چ دەبوو هەردووکتان بەهەمان ئەنجام دەگەیشتن. (ئەمەیە شێتبوونی ساتە وەختیانەی شاعیرانە[٦٠] ئۆڕێڵ! خراپ نییە جاربەجارێ مرۆڤ بە گاڵتەوە تەعبیر لە واقیع بکا[٦١] لەگەڵ ئەوەشدا — وادەهاتە پێش چاو- کە لەو سەردەمەیدا هەستت بە بۆشاییەك دە ژیانی خۆتدا کردو ناردت بەشوێن مندا.

...ێک زۆر بۆت نەگونجا خودا بهێنییە جێگەی دایکی خۆت. بەو جۆرە دیار بوو پاش کۆچی ئەو، خواوەند تەنێ شتێ بوو لەبۆ تۆ مابۆوە، دایکێکی نوێ. چونکە لە سەرەتاوە مۆنیکا لەجیاتی یەزدان لەگەڵ تۆ بوو، ئێستاکەش وا دیارە لەجیاتی ئەو یەزدانت لەگەڵدایە. سەرەتا ئەو بوو خۆی خستە نێوانمانەوە و پاشانیش خودای عیسای مەسیح بوو شوێنەکەی پڕکردەوە.

جارەهای جار لەخۆمم پرسیوە: ئایا بەڕاستی ئەوە هەر دایکی خۆت نەبوو دەسەڵاتی خۆشویستنی ئافرەتێکی لێفڕاندی. ئایا لەبەر ئەو هۆیە نەبوو چوون تۆ ئەمنت خۆشدەویست، مۆنیکا لە هەوەڵێرا رقی دەبۆوە لەوەی لەگەڵ تۆدا پێکەوە لەخانوویەکدا بژی و لەسەر یەك سفرەش نانت لەگەڵ بخوا؟ ئۆرڵ (بنۆرە) کتێبی سێیەم. ئایا هەر لەبەر ئەوەش نەبوو سەرلێشێواوانە چوو بۆ میلانۆ تا ژنت بۆ بێنێ؟ کتێبی شەشەم. ئەدی هەر بەهۆی هەمان هۆکاریشەوە نەبوو، تۆ دوورەپەرێزی و داوێنپاکیت هەڵبژارد؟

لەپاش تێپەرین بەسەر رووباری ئارنۆدا، دەستێکی میهرەبانت لەسەرشانم داناو وێستاندتم و داوات لێکردم رێگەت پێدەم بۆن بەمووەکانمەوە بکەی. گوتت، (حەیف ژیان کورتە)[٦٢]، ئۆرڵ، بۆچی ئەو قسەت بەزاردا هات؟ و بۆچی ویستت قژی من بۆنکەیت؟ دەتویست چ پەیمانێ ببەستی؟

هەتا سەرەتای کتێبی چوارەم ئاماژەیەك بە من ناکەی، نووسیوتە: (لەو ساڵانەدا ژنێکم هەبوو لەگەڵمدا دەژیا، وەلێ نەبەو جۆرەی پێی دەڵێن هاوسەرگیری یاسایی. ئەو بووە خۆراکی هەستە ناهاوسەنگ و جڵەو نەکراوەکانی من. وەلێ هەرتەنیا ئەویش بوو، وەك هاوسەرێکی یاساییش بەوەفاداری لەگەڵیدا مامەوە)[٦٣].



کاتێ ئەم بەشەم لەبارەی هەستە ناهاوسەنگ و جڵەونەکراوەکانت خوێندەوە، بێدەسەڵاتانە دامە قاقای پێکەنین، چونکە بەلای منەوە هەستەکانی تۆ هەم هاوسەنگ بوون و هەم دەستەمۆش، ئەمەت بەڕاستگۆیی پێدەڵێم. وێڕای ئەوەی کە بەردەوامیش بوون، ئەگەرچی جارجارێ بریقانەوەی خۆی لەچاو کاتەکانی تردا کەمدەبۆوە. بێجگە لەوە، بەهیچ جۆرێ من خۆراك نەبووم. هەروەکو بۆ خۆشت ئاماژەت پێداوە، ئێمە بەشێوەی هاوسەری یاسایی دەژیاین، بەو جیاوازییەوە کە ئێمە بەبێ دەستێوەردانی دایك و باوکمان لەگەڵ یەکدا پەیوەندیمان بەست. ئەگەر منت خۆشنەویستبا بەبێ دوو دڵی ئافرەتانێکی دیکەت هەڵدەبژارد، یاخود دەچوویە ئەو جۆرە شوێنانە. ئێمە هاوسەری یاسایی نەبووین و ئەگەر لەبری من یارێکی دیکەت هەڵبژاردبا، هەموو لێت حاڵی دەبوون. وەلێ تەنیا رێگرێکی نێوان من و تۆ مۆنیکا بوو لەپاش ئەوەیش ویژدانێکی نائارام کە بەردەوام لە تۆی دەخوری پەیوەندیی ئەڤینداری ئێمەت بەجۆرێ قایمکردووە، بۆی هەیە ببێتە رێگر لەبەردەم رزگاری رۆحتدا.

پاشان لەبارەی کلاودیۆسەوە[٦٤] نووسیوتە بە (تا) مرد. (بەدبەخت بووم و هەر رۆحێ لە ئەڤیندا بەکەسێکەوە پەیوەست بێ تاسنووری هەلاکەت، بەدبەختە.. زۆر تێکشکاوانە لەژیان بێزار بووم و لەهەمان کاتیشدا لەمردن تۆقیبووم)[٦٥]. پاشان درێژەی دەدەیە: (رۆحێکی وێران و خوێن لێڕژاوم لەگەڵ خۆم هەڵگرتبوو، وەلێ شوێنێکم نەدەبینیەوە تاکو ئۆقرەی تیا بگرێ. نە دەنێو باخە خۆشەکانا، نەلە یاری و سترانەکانا، لەبۆنی عەتری گوڵەکانا، نە لە میوانداریيە شکۆدارەکاندا، نە لەچێژە جەستەییەکاندا و تەنانەت نە دەنێو کتێب و شیعریشدا، (نەمدەدییەوە)،[٦٦].

[illegible]نی ئەوکاتەم لەبیرە، چونکە ئەو دەمە بۆ هیچکامێکمان ئاسان نەبوو. لەگەڵ [illegible]ڕشدا: لەتەواوی ئەو ماوەیەدا ئێمە یەکترمان هەبوو، ئەمێستاکەش کەهاوڕێکەی تۆ لەبەین چوو بوو، من تەنیا مایەی سەبووریت بووم. لەو بڕوایەشدام هەر لەو کاتەوە بوو کە بەجیدی کەوتیتە دوای راستی، راستییەك بتوانێ رۆحت لەشتە بێ بەقاکان رزگار بکا. پێمگوتی: *لە نزیك منەوە بمێنەرەوە، ژیان ئەوەندە کورتە و دڵنیاییەك نییە سەبارەت بەوەی ئەبەدیەتێ بۆ رۆحە دارماوەکانی ئێمە هەبێ، رەنگە ئەمە تەنیا ژیانێکی ئێمە بێ. ئۆرڵ، تۆ هەرگیز بڕوات بەشتێکی ئەو تۆ نەهێنا. زەینی خۆت هەڵدەشێلا تابتوانی ئەبەدیەتێ بۆ رۆحت دابین بکا. رزگارکردنی رۆحی خۆت لە دۆزەخ بەلاوە گرنگتربوو لە رزگارکردنی رۆحی من.*

بەمجۆرە تاگاستەمان بەجێهێشت و گەڕاینەوە بۆ قەرتاجنە. من لەخۆشییاندا دە پێستی خۆمدا جێم نەدەبۆوە، چونکی بۆ ئێمە هاومالەتی لەگەڵ مۆنیکادا ژیانێکی شایان نەبوو. نووسیوتە: (رۆژەکان هاتن و تێپەڕین، هەر رۆژێ کەدەڕۆیشت هیوایەکی نوێ و بیروڕاگەلێکی تازەم لەلا دروستدەبوو، بەو شێوەیەش لەسەر هەمان چێژەکانی پێشوو، هێواش هێواش خۆمم دۆزییەوە)[٦٧] وەلێ تۆوێ چێنرابوو و شەوق و گەماییەکی نوێ لەتۆدا برەویان سەندبوو.

سەیرە لەوە زیاتر لەمەڕ ئادیۆداتۆسەوە نانووسی. هەر چەندە لەو شوێنەی ئاماژە بە (هەمان چێژەکانی پێشوو)دەکەی، پێدەچێ لەگەڵ ئەوت بێ.



## سیپارەی پێنجەم

لەکتێبی پێنجەمدا سەبارەت بەگەشتی قەرتاجنە بۆ رۆما نووسیوتە: (دایکم بە رۆیشتنم زۆر بەخۆیدا شکایەوە و تا کەناری دەریایێ بەرێی کردم. زۆری هەوڵدا نەڕۆم و گلمباتەوە، داوای ئەو بریتیبوو لەوەی، یان پێکەوە بچینە شوێنی لەدایکبوونم یانیش ئەوی لەگەڵ خۆم ببەم)[٦٨]. ئۆرڵ، بەبیرت دێ چ فێڵێکمان لێکرد. بردت بۆکەنیسەی سیپریان (Cyprian) تاکو لەوێ رۆژبکاتەوە. ئەوەدەم لەنێو تاریکایی شەودا لەنگەرمان گرت، من وتۆ و ئادیۆداتۆسی چکۆڵە، کە لەو کاتەدا تەمەنی یازدە ساڵان بوو. لەبیرمە سەرت کردە سەرم و گوتت شاژنێ لەگەڵ ئاینیاسدا دەچێ بۆ رۆما. هەر بەڕاستیش هاوکات لەگەڵ ئەوەی لەقەرتاجنە دوور کەوتینەوە هەستی (دیدۆ)یەکی ئازادبووم هەبوو. ئەو پرسیارە سەیرەم بیرکەوتەوە کەپێش دەساڵ لەمنت کرد: ئایا تائێستێ چوویت بۆ رۆما؟ چەندە دڵنیابووم ئەو کارەی دەیکەین، راستە. ئەگەر بڕیار بوو لەگەڵ یەکدا داهاتوویەکمان هەبێ، دەبوو بەشێوەیەك خۆمان لە مۆنیکا دابڕکردبا.

ئینجا (تا)ت لێهات، وەلێ من تیمارم کردی و دۆعام بۆکردی. لەبیرمە چەندێ لەمەرگ دەترسای، بەردەوام دەتپرسی: (ئیدی تەواو دەبم؟ ئایا لەدەست دەردەچم؟) هێشتا رێگایەکت بۆ رزگاریی رۆحی خۆت نەدیبۆوە. نووسیوتە: (تا)کە بەرز دەبۆوە و من هیچی وام نەمابوو بۆ هەلاکەت و مردن. ئەرێ بەڕاست ئەگەر ئەوکاتە گیانم

[illegible] پەروەردگار دەکردەوە دەچوومە کویٚ؟ بەڵێ، دەچوومە بنی دۆزەخەوە و ئەو زابەم دەکێشا کەبەپێی فەرمانی لەسەر حەقی تۆ شایانی کردەوەکانم بوو)[٦٩].

ئۆرڵ، پەنا دەبەمە بەر خودا، ئاخر ئەمانەی (تۆ دەیلێی) جگە لە شێواندن و ئەفسانەهۆنینەوە چیترن؟ تۆیەك ئەوەندە بەوریاییەوە گاڵتەت بە بەسەرهاتی خواوەندە ئەفسانەییەکان دەکرد، کەچی باوەڕت بە خودایەکی تووڕە هەیە کە کردەی بەندەکانی خۆی تا ئەبەدییەت سزا دەدات و گرفتاریان دەکا بە عەزاب؟ کەمێ جێگەی خۆشحاڵییە کاتێ لەو ژوورە شرۆڵەی ڕۆمادا بەنەخۆشی کەوتبووی، باوەڕت پێی نەبوو. تەنێ ئەوەندە بوو تا ئەو پەڕی دەترسای نەکا ڕۆحت دووچاری عەزابی ئەبەدی ببێ[٧٠] و ئەوەش کەدەبوو ترسی تۆ دامرکێنێتەوە و بەرستەی فەیلەسووفەکانی دالآن[٧١] ئارامت بکاتەوە، من بووم. هەروەها سەبارەت بە نەسرانی و هیوای مەسیحایی قسەمان کردن، بەڵام هیچکامێکمان تەنانەت لەو بیروباوەڕانەی وەك سووتان لە ئاگر و عەزابی پڕ دەردی ئەبەدی، نزیك نەکەوتینەوە. ئێمە پێگەیشتووتر بووین. ئەدی بۆ لەم ڕۆژانەدا ئۆستادی شکۆداری زانستی بەیان ئاوا ڕەفتار دەکا؟ و بڕوای وایە ئەسقەفی هیپۆرگیۆس تا چەند ساڵێکی تر لە بەهەشتی پڕکامەرانیی خوداکەیدا شوێنێکی ئاسایشی پێدەبڕێ، لەکاتێکدا کە فلۆریا ئامیلیا لەبەر ئەوەی هێشتا ڕەزامەندی نەداوە بۆئەوەی تەعمید بکرێ، بۆ هەمیشە لەئاگری دۆزەخدا دەسووتێ و دووچاری عەزابی دەرداوی دەبێ؟ نەخێر، پایەبەرز، پێویستە جەنابت بەخێرایی ئەم شێوازەی فێرکارییە ئاراستە بکەی، بەپێچەوانەی ئەمەوە، من تەنانەت تۆزێکیش مەراقی تەعمیدکردنی زیاتری خەڵك و گەشەکردنی کەنیسەی جیهانی نیم. ئێمە هەردووکمان ئاگادارین کەچۆن بەو دواییانە گەندەڵی سیاسی کۆمەڵگاکەمانی گرتۆتەوە. کەواتە نابێ سەرسامی بمانگرێت ئەگەر باوەڕ و خووەکانیش دووچاری گەندەڵییەکی لەو جۆرە بن.

زوو چاکتر بوویەوە. لەبیرم نەچووە چۆن تایەکە لەپڕ نەما، و چەند ساتێ لەوە دواش هەستایە سەرپێ. پاشان بۆ پیاسەکردن پێکەوە چووینە شار، من وتۆ. لەدوای ئەوەش



بۆ چەند مانگێ وانەی زانستی بەیانت دەگوتەوە. هاوکاتیش بە بەشداریکردن لە گفتوگۆی ئەو فەیلەسووفانەدا کە بە ئەندامانی ئەکادیمیای ئەفلاتوون بەناوبانگ بوون، ڕۆحی خۆت تێر دەکرد[٧٢]. من بەردەوام مۆڵەتی ئەوەم هەبوو لەگەڵتابم، بەتایبەتی ئەو کاتانەی دەتویست کەسانێکی تازە بناسی، فەخرت دەفرۆشت و لەخۆبایی وەك داگیرکەرێ بەوەی منت لە کەنارا بووم، نەك لەبەر ئەوەی منت هەڵبژاردبوو، بەڵکو زیاتر بەو هۆیەوە من ئەتۆم هەڵبژاردبوو.

لەپاش ئەمەوە بوو کە بە پلەی وانەبێژی پاشایەتی هونەری مەعانی و بەیان، لەمیلانۆ دامەزرایت. سەفەر بۆ ئەوێ ئەزموونێکی بێنموونە بوو، باشترە ئەو ئەزموونە بە دەوڵەمەندترین ئەو کاتژمێرانە بزانین کە پێکەوە تێمان پەڕاندن، ئایا ئەو ڕۆژە دڵڕفێنەی پاییزت لە بیرماوە کەپێکەوە بۆ پیاسەکردن چووین بۆ شەقامی کاسیا. تۆ و من و ئادیۆداتۆس، لەگەڵ دەستەیەك لەهاوڕێکانماندا، ئۆرڵ، تەنانەت لەگەڵ ئەو گرووپەشدا کە پێشتر نەماندەناسین.. کۆمەڵێکی زۆر بووین.

ئەمجا گەیشتینە کۆنەشاری فلۆرەنتینا[٧٣] کە سەربازگەیەکی تێدا بوو و دەکەوتە کەناری ڕووباری ئارنۆوە. لەبیرتە چۆناهی وێستاین و ئاماژەمان بۆ چیا بەبەفر داپۆشراوەکان کرد، کە لەناو درەختەکانەوە دیاربوو؟ ئۆرڵ، تۆ تەنێ ڕوانگەکانت دێنەوە بیر، ئەی ناتوانی بەلای کەمەوە هەندێ لەئەزموونە واقیعیەکانیش بخەیتەوە بیرت؟ لەپاش چەند ساتێ لەڕووبارەکە پەڕینەوە، هێشتا لەسەر پردەکە بووین کە لەدواوە هاتیتە لام. لەگەڵ چەند کەسێ لە پیاوەکان سەرقاڵی گفتوگۆیەکی گەرم بوویت کاتێ لەپڕ گەیشتیتە تەنیشتم. لەسەرشانم هەستم بەدەستت کرد، پاشانیش هێمنانە بەرەو خۆتت هێنام بەگوێچکەمتدا چرپاند: (*فلۆریا، ژیان گەلێ کورتە*).

پاشان مەچەکمت گرت و بەتوندی گوشیت. وەك ئەوەی لەو ساتەدا سوور بوویت لەسەر ئەوەی هەرگیز ناتەوێ ئەو ئان و ساتەت لەبیر بچێتەوە. هەر ئالەوێشدا بوو پرسیت ئایا

...وا... بۆنی پرچەکانم بکەیت، ئەوە بوو بۆنت کردن. ئەوساتەی پرچە درێژەکانمت ...ەڵاکردن تا بۆن بەعەترەکەیانەوە بکەی، لەسەر گەردنم هەستم بە هەناسەت کرد. وەک ئەوەی بتەوێ سەراپای بوونم هەڵمژیتە ناو خۆتەوە، مەبادا جێگەی من ناو دەروونی بوونی تۆ بێت. ئاوا بوو دەتویست تێمبگەیەنی بۆ هەمیشە هی تۆ دەبم، چونکە تازە ڕۆحمان تێکەڵ ببوون. ئەمە پێش ئەوەی بوو مۆنیکا بێت بۆ میلانۆ، لەپێش ئەو بەرنامە جاڕزکەرەی ژنهێنان و لەپێش ئەوەدا خوداناسە مەسیحییەکان ببینی.

ئەسقەفی مەزن، کەوابێ مەیە و بڵێ ئەوەی لەسەر پردی ڕووباری ئارنۆ ڕوویدا، لەئەنجامی (مەیلە نەفسانییەکان)، یاخود (تەسلیم بوون بە نەفس) بوو. ئەوێ ڕۆژێ کەسانێکی زۆر لەمەیان دەنۆڕی، ڕەنگبێ هەر لەبەر ئەم تایبەتمەندییەش بێ کە من ئاوا بەڕوونی لەبیرم ماوە. لەوێ لەسەر ئەو پردە، لە نکاو کارێکت ئەنجامدا، کە دەتزانی بەلای منەوە زۆر بەبایەخە. بەبڕوای من ئەوەی تۆ کردت، دەربڕینێکی قووڵ بوو بۆ قەبوولکردنی ئەو ڕاستییەی کە من ئافرەتی ناو ژیانی تۆم، ئەگەرچی بەپێی یاسا هاوسەرت نەبووم. لەهەمان کاتیشدا بڕوام وایە دەیتوانی بەیانکەری جۆرێ لە ئازادی بێت، چونکە دواجار ئێمە توانیبوومان بەئاسانی لەسەر عەردێ بێین و بچین کە زۆر لە مۆنیکاوە دوور بوو. ئایا هەریەکێ لە ئێمە بەجۆرێ ڕاکردوویێ نەبووین؟

ساڵانێکی زۆر بەسەر ئەو زەمانەدا کە ئێمە هەردووکمان پێکەوە لە ئیتالیا دەژیاین، تێپەڕیوە و لەو ماوەیەشدا ڕووداوگەلێکی زۆر ڕوویانداوە، وەلێ ئایا ئەو ڕاستییەی کە بۆنکردنی عەتری پرچی من لە ساتێکدا کە پێکەوە لەو کەنارانە پیاسەمان دەکرد، چێژی بەهەردووکمان دەبەخشی، دەبێتە هۆی ئەوەی یەزدان لە تۆ، بەڵێ لەتۆ، تووڕە ببێ؟ ئایا بۆ جوبرانکردنەوەی گوناهگەلێکی لەمجۆرە بوو کە ڕێگەی دا تاقانە کوڕەکەی بەخاچدا کرێ؟ لەو سەفەرەدا من و تۆش کوڕێکمان هەبوو کە لەدەوروبەری دایک و بابی خۆیدا هەڵبەز و دابەزی دەکرد — وەلێ لە خاچدران لەبەر خۆشەویستی؟ لەبەر



خاتری ڕزگار بوونی ڕۆحی تۆیە ئارەزووم وایە خۆزگە خوداکەی تۆش بووبێتە خاوەنی ئەو توانا گاڵتەجارییەی کە تۆ لە پێش دیتنی خوداناسەکاندا هەتبوو. لەم بارەشدا دەبێ گاڵتەکانی ئەویش لەوانەی تۆ تاڵتر بن، ئەگەرنا بۆی هەیە ئەو بەوجۆرە بیرکاتەوە کە ڕۆحی تۆ لەپاش ئەو پیاسەیەت لەگەڵ مندا لەسەر ڕووباری ئارنۆ، هێندە گەنیوە، بۆ ڕزگاربوون ناشێت. پایەدار، بەپێی ڕێسا لەهەرجێ ئاوەز و عەقڵ زیاتر بێ، کەمتر حساب لە بۆ عەشق دەکرێ[٧٤].

لەوبەری ڕووبارەکەوە بەلای ژمارەیەك دەستفرۆشدا تێپەڕین، من لەکەنار یەکێکیانەوە وێستام تا بنۆڕمە ئەمووستیلەیەکی هەڵکۆڵراوی قەشەنگ[٧٥] تۆش لە بۆمت سەند و ئەمێستاکەش لەناو دەستمدا پێوەی دانیشتووم. خەریکم توند دەیگوشم. بەشکم یەزدان لەبەر ئەوەی شتێکی (جەستەییم) لەدەستمدا ڕاگرتووە، لێم ببوورێ. چی بکەم؟ ئەمە تەنیا شتێکە هەمبێ. من هێشتاکە نوورێکم بەدیدەی گیانم نەدیوە، نەشتێکی ئەودیو سرووشتیم بینیوە و نەگوێشم لەدەنگێ بووە. هەربۆیەشە وا پێدەچێ من هێشتاکە هەر ئافرەتێکی ساکار بم. سەبارەت بەتۆش جگە لە ئاواتی ڕزگاربوونی ڕۆحت، ئارەزوویەکی دیکەم نییە[٧٦] وەلێ، *ژیان چەندە کورتە و منیش چەندە کەمزانم.* ئێمە هاتین و بەهەشتێ بەسەر سەرمانەوە نەبوو، وەرە با وای دابنێین ئەم ژیانە تەنیا شتێکە بۆی دروستبووین. لەو بارەشدا خۆزگە ڕۆحی ئێمە تا ئەبەد بەسەر ڕووباری ئارنۆوە لە فڕیندا دەماوە. ئەدی مەگەر لە فلۆرەنتینا نەبوو *فلۆریا* کرایەوە[٧٧] و ئایا لە تیشکی زەردەپەڕی سەر ڕووباری ئارنۆدا نەبوو کە نێوچەوانی ئۆڕلێ بە نووری ئاڵتوونیی درەخشایەوە[٧٨].

## سیپارەی شەشەم

پاشانیش، سەرئەنجام لە میلانۆ چاوت بە ئەسقەفی ئامبرۆسیۆس کەوت. نووسیوتە کە بەدیتنی خۆت (ئەو بەلای مەردمی دنیاوە پیاوێکی بەختەوەر بوو، چونکە دەسەلاتدارانێکی زۆر ڕێزیان لێدەگرت)[79] تەنێ ڕەبەنییەکەی تۆی زویر دەکرد. ئای، دەبوو ڕۆحی تۆ بەرگەی چەند ئازار بگرێ، چوون تا دەهات پتر بڕوات بەوە دێنا لەپێناوی ڕزگاریی ڕۆحتدا دەبێ خودی ئەڤین ڕەتکەیتەوە.

لەکۆتایی بەهاردا مۆنیکا گەیشت، نووسیوتە، ئەو لەعەرد و دەریاکاندا بۆت گەڕابوو. جێگەی لە نێوانماندا کردەوە. ڕووی لەتۆ و پشتی دە من، ئەمە وێڕای ئەوەی دەیزانی ئێمە هەردووکمان یەکین. مۆنیکا بەدوو مەخسەدان هاتبوو، یەکەمیان ئەوەبوو تۆ تەعمید و پاکژ بکاتەوە، دووەمیشیان ئەوەبوو هاوسەرێکت لەبنەماڵەیەکی ڕێزدار بۆ هەڵبژێرێ. بەبڕوای من مەبەستی دووەمی بەلاوە گرنگتر بوو. ئەتۆ بەخۆت سەبارەت بە هەمووشتێ دوودڵ بوویت و گومانت هەبوو، وەلێ بڕیارتدا (لەکاتی ئێستادا و بەپێی پێشنیاری سەرپەرشتکارانم پەیوەندیی بە دەستەی کەنیسەی کاتۆلیکییەوە بکەم، بەشکم نورێ بێتە سەر ڕێم و لەبەرەکەتی وی و بەمتمانەی نەفس بتوانم ڕێگای خۆم بدۆزمەوە)[80]. لەکتێبی شەشەمدا جاڕ دەدەی:



(ئاه، ئەی (پیاوانی) ژیر، ئێوەن مەردمێکی مەزنن، ئایا بۆی هەیە بەیەقینێ بگەین تاکو ژیانی خۆمانی لەسەرەوە ڕۆنێین؟)[81].

ببوورە لەوەی بەشێکی زۆری کتێبەکەت دەنووسمەوە، هۆیەکەی ئەوەیە لەهەندێ شوێنی پچڕپچڕدا وای پیشان دەدەی بەچ تەقەللایەك ویستووتە هەستەکانت کۆبکەیتەوە: *(ئەگەر مەرگ کۆتایی بهێنێ بەهۆشیاری، سەبارەت بەو ئازارانەی ڕۆحی ئێمە دەیانچێژێ، چی ڕوو دەدا؟ بەڕاستی ئەمە بابەتێکی لەبارە بۆ گفتوگۆ. وەلێ نابێ وابێ و کەمێ دووریشە لەواقیعییەت. بێ هۆ نییە کە باوەڕی مەسیحایی هێندە بڵاوبۆتەوە و لە سەراپای جیهاندا پەسەندی هەمەلایەنەی پێدراوە. هەرکاتێ مردنی جەستە بەمانای کۆتایی ژیانی ڕۆح بێ، نەدەشیا خواوەند لەپێناوی مەدا ئەو هەموو کارە گەورە و سەرنجڕاکێشانە ئەنجام بدا. بۆچی ئێمە هێشتاکەش دوودڵین لەوەی ڕوو لە ئومێدە بەسەرچووەکان وەرگێڕین و سەرانسەر خۆمان تەرخان بکەین بۆ دۆزینەوەی یەزدان و کامەرانیی نەبڕاوەی ژیان؟ وەلێ پەلەکەن. هەرچییەك بێ لەم جیهانەشدا هێشتاکە خۆشییگەلێکی ئەوتۆ ماون کە هەریەکەیان سەرنجڕاکێشیی خۆی هەیە و ئەوەش شتێکی کەم نییە. ئێمە نابێت لەپێناوی سەرکوتکردنی مەیلەکانماندا بەرەو ئەو لایە بڕۆین. چونکێ لەپاشاندا گەڕانەوە بەرەو ئەو چێژانە وەك مەحاڵ دێتە پێش چاو. ئایا ئەمە دەستکەوتێکی کەمە بۆ گەیشتن بەپلەیەکی بەرز؟ دەتوانین لەمە زیاتر چاوەڕێی چ شتێکی دیکەمان هەبێ؟ من هەڤالانێکی خاوەن دەسەلاتی زۆرم هەن، ئەگەر نەمەوێ زۆر لەسنووری خۆی زێتر چاوەڕوانیم بەرمەسەرێ، بەلای کەمەوە دەتوانم داوای حکومەتێکی خۆمانەیی بکەم. پاشان دەتوانم هاوسەرێکی دەوڵەمەند هەڵبژێرم، کە نەیەوێ بارێکی گرانی ماڵییم بخاتە سەرشان. (ئەمە) ڕەوتێکی باشە بۆ گەیشتن بەئامانج. زۆرن ئەو پیاوە مەزنانەی کە*

*یان هەیە سەرمەشق بن، وێڕای ئەوەی ژنیشیان هەیە کەچی ژیانی خۆیان بۆ پێدانەوەی زانست و ئاوەز تەرخانکردووە. ئەمانە ئەو گفتوگۆیانە بوون کە دەگەڵ خۆمدا دەمکردن، و لەگەڵ گۆڕانی ئاراستەی بادا، دڵم بەملاولادا دەهات و دەچوو. لەهەمان کاتیشدا زەمەن تێدەپەڕی و چوونم بەرەو یەزدانی پایەدار دوا دەخست. لە تۆداژیانم لەمرۆوە دەخستە سبەی. وەلێ کاریگەریی ڕۆژانەی مردنم لەسەر خۆم پێ دوانەدەخرا)*[٨٢].

مەبەست ژیانە، ئەگەرچی بەڕاستی تۆ لێرەدا بەژیان دەڵێی مەرگ، ئەوەش تۆی کە ئاوا دەکەی، تۆیەك کە سەردەمانێ لەکاتی پیاسەکردندا بەسەر پردی رووباری ئارنۆدا، چەمایتەوە تا عەتری پرچەکانی من بۆنکەیت. پاشان بەردەوام دەبی: (من خۆشییە راستەقینەکانی ژیانم خۆشدەویستن، وەلێ دەترسام لەوەی بەدوویاندا بگەڕێم، کاتێکش دەمدیتنەوە، لێیان هەڵدەهاتم. ئاخر دەمزانی ئەگەر بەبێ بوونی ژنێ بەردەوام بم، زۆر ناکام دەبووم)[٨٣].

ئۆرڵ، ئەوە بوونی من بوو کە نەتدەتوانی بەبێ ئەو بژی، ئێمەش لەو بارەوە گەلێ دوابووین. ئایا نەتدەتوانی ئاماژەیان پێبکەی؟ ئاه، چ دەکرێ، مرۆ دەبێ لە ناوهێنانی کەسەکاندا ڕەچاوی دوایی بکا[٨٤].

بەردەوام سەبارەت بەم مەسەلانە لەگەڵ (ئالیپیۆس)دا گفتوگۆت دەکرد:[٨٥] (هیچکامان بەتایبەتی مەیلمان نەبوو بۆ ئەوشتەی ژنهێنانی دەکردە شتێکی سەرانجراکێش، بەهەمان شێوەش پێکەوە نانی ماڵ و پەروەردەکردنی منداڵانمان بەئەرکێکی زەحمەت دەزانی. خاڵی سەرەکی ئەوەبوو من واراهاتبووم مەیلە نەفسانییە تێر نەبووەکانم تێرکەم، کە بێ شەرمانە کردبوویانمە دیلی خۆیان و دەروونیان کردبوومە مۆڵگە)[٨٦].



ئۆرڵ، ئەوەی دەروونی تۆی کردبووە مۆڵگە، ژنهێنانێ بوو -من بەو بۆنەیەوە کە هەژاربووم بۆی نەدەگونجام- و خیانەتی تۆی بەمن دەسەلماند. ئاخر ئۆرڵ، مەگەر ئێمە دوو رۆحی هاوزاد نەبووین، ئایا لە جەستە و رۆحدا ئەوەندە لێکدی نزیك نەبووینەوە، کە جۆێکردنەوەمان پێویستیی بە نەشتەرگەری هەبوو نەك بەدایکێ لەشێوەی خوازبێنیکەرێکدا؟ پاشان ئایا ئێمە ئادیۆداتۆسمان نەبوو تا بیری لێبکەینەوە، ئەو، کە لەو کاتەدا دوازدەساڵان بوو[٨٧].

نووسیوتە: (بەزۆر پێشنیارم پێدەکرا بۆ ئەوەی ژن بهێنم. خوازبێنیم کرد و رەزامەندیم وەرگرت. دایکم بە حەزێکی زۆرەوە سەرقاڵی جێبەجێکردنی ئەمکارە بوو. ئەو دەیویست یەکەمجار ژن بهێنم و پاشانیش لە پاکژاودا تەعمید بکرێم)[٨٨].

ئەو دەم دایکت کەوتە گەڕان بەدووی مندا. هەرگیز ئەوەم لە بیر ناچێتەوە کە مۆنیکا چۆن لەپڕ دە ژوورەکەمدا، کاتێ سەرقاڵی خۆشتن بووم، قووت بۆوە. تۆ تازە چووبوویە کۆلیژی زانستی بەیان و بەدرێژایی ڕۆژ لەوێ دەمایەوە. پێمگوترا شڕوشیتاڵی خۆم بپێچمەوە و خۆم گوم کەم. بۆ چوونم لەبۆ ئەفەریقا هەموو شتێ ئامادەکرابوو، دەستەیەکیش هەر ئەو پاشنیوەڕۆیە بەڕێ کەوتبوون. تۆش خوازبێنی کچێکت کردبوو و وەڵامەکەش ڕەزامەندانە بوو. سەرپەرشتیارانی کچە مەرجێکیان بۆ دانابووی، مەرجەکەش ئەوە بوو من بەزووترین کات لەژیانی تۆدا نەمێنم.

لەو بڕوایەدا بووم، مۆنیکا لە تۆڵەی ئەو نیوەشەوەی لە قەرتاجنە بەتەنیا جێمان هێشت، ئەمکارەی کرد. وا دەهاتە پێش چاو دەبوو ئێستێ زۆرانبازێ بکەین تا بزانین کاممان ئازاترین.

وەلێ ئەو بەمنی گوت کە تۆ داوات لێکردووە پلانی دەستبەسەرکردنی من دابنێ چونکە بۆخۆت توانای ئەوکارەت نەبوو. هەروەکو ئەو شوانەی کەناتوانێ پەزی خۆی

[illegible] من بڕوام بە قسەکەی کرد و ئەوەش گەورەترین هەڵەی ژیانم بوو[٨٩]. گومان تۆش ئەوەت دەزانی کە من لەو جۆرە ئافرەتە غەمبارانەم کە گوایە لەژێر عەباکەی ئۆرپیدسەوە هاتوونەتە دەرێ[٩٠]. هاوبەشی ژیانم بە بەهانەی ئەڤینی خوداییەوە، خیانەتی لێکردم[٩١].

باوەڕمکرد ئەوە ویستی لەوەبەر بیرلێکراوەی تۆیە، کە من بگەڕێمەوە بۆ قەرتاجنە، بۆ ئەو شوێنەی سەردەمانێ لەژێر درەختی هەنجیرێکدا یەکدیمان دیتبوو، تا ئەوە بوو تۆم لە ڕۆما بینی و سوێندت خوارد کە بەبێ ئاگاداری و ویستی خۆت منیان پاڵ پێوە نابوو.

هەروەها مۆنیکا لە شێوەی دەلالێکدا بیری هێنامەوە کە ویستووتە پەیمان بدەم هەرگیز لەگەڵ پیاوێکی تردا نەژیم. منیش ئەمەم وەك نیشانەیەك وەرگرت کە تۆ هێشتا بڕیاری لەسەداسەدت نەداوە و ڕەنگبێ ئێمە جارێکی دی بگەڕێنەوە بۆلای یەکتر. هەتا ئەمڕۆکەش ئەوە بۆ من نهێنییەکە، بۆچی مۆنیکا ئەو پەیمانەی لێوەرگرتم، چونکە گومانم نییە لەوەی تەنیا شتێ ئەو دەیخواست ئەوە بوو من دوورکەومەوە و ڕێگاکەی بۆ چۆڵ بکەم. ئایا لەبەر ئەوە بوو کە سەفەرەکەم بۆ ئاسانتر بکا؟ یان ڕەنگبێ وەهای زانیبێ ئەگەر نەمتوانی پیاوێکی دی ببینمەوە، ئەوە ئاسانتر مل بۆ تەعمیدکردن دەدەم. وەلێ هێندەی نەبرد کە ئەو نامەیەم لە تۆوە پێگەیشت و دووبارە تیایدا داوات لێکردمەوە کەخۆم نەدەم بەدەست کەسی ترەوە. تەنانەت نووسیبووشت کە وای بۆناچی چ بەرهەمێ لەو ژنهێنانە بەنسیبت ببێ. بەڵام لەهەمووی گرنگتر، ئەو نامەیە بوو کە لەمیلانۆ وە بۆمنت نووسیبوو و بەم ڕستانە کۆتایت پێهێنابوو: (فلۆریا، فلۆریا، دڵم لەبۆت تەنگ بووە، دڵم تەنگە بۆت).



ئەو ڕۆژە ئادیۆداتۆست لەگەڵ خۆتا بردبوو بۆ کۆلیژ و بەو جۆرەش نەمتوانی تەنانەت پێش ئەوەی شمەکەکانم کۆبکەمەوە و لە خەڵك و تاقانە کوڕەکەم جیاببمەوە، بۆ دواجار لەباوەشمی بگرم. ئا بەم جۆرەش بوو هەمووشتێکم دەگەڵ خۆمدا برد[٩٢].

من ئەو کارەم نەکرد کە دیدۆ کردبووی، کەوابێ ئەو ڕۆژە لەعنەتییە دەژێر دارهەنجیرەکەدا لە توانای خۆم زیاتر پەیمانم دابوو. لەلایەکی تریشەوە، ئەگەر ئادیۆداتۆسیشم لەگەڵ خۆما بردبا هەمان ئەو کارەم نەدەکرد کە مدیئیا کردبووی[٩٣]، وەلێ تازە من ڕۆیشتم.

## سیپارەی حەوتەم

نووسیوتە مۆنیکا بەچ خۆشحاڵییەکەوە هەوڵی دەدا تابڕیاری ژنهێنان بدەیت: (ئەو کیژۆڵەیەی داخوازیم کردبوو تەمەنی دووساڵ لە تەمەنی شووکردن گچکەتر بوو. وەلێ چوون حەزم لێکردبوو ئامادەبووم ئەو ماوەیە چاوەڕێ بکەم)[٩٤]. باشە، واهەستدەکەم لەجێی خۆیدا بوو بفەرمووی تۆ هەر لە بنەمادا حەزت لە سەبرگرتنە. من خۆم زۆر بێ هیوا بووم لەوەی تەنانەت یەکدوو ڕستەش نانووسی لەسەر بیروڕای خۆت دەربارەی دایکت، کە چۆن جڵەوی کارەکانی گرتنە ئەستۆ و لە کاتێکدا تۆ و ئادیۆداتۆس لەماڵ نەبوون، منی پاڵ پێوەنا سەفەر بکەم. تۆ گەڕایتەوە بەسەر ماڵێکی چۆڵدا و منیش، منێ کە بەدرێژایی ڕێگا لە ئەفەریقاوە تا ئەوێ هاوسەفەرت بووم، دیار نەمابووم. ئۆڕڵ، من، ئەو کەسەی لەسەر پردی رووباری ئارنۆ پیاسەت دەگەڵ کردبوو، دیار نەمابووم هەرهێندەیە نووسیوتە:

(ڕێگەیان بەو ئافرەتە نەدا کە لەگەڵی دەژیام، لەلام بمێنێ. ئەوان ئەویان لەمن دوور خستەوە چونکە ڕێگربوو لەبەردەم ژنهێنانمدا. ئەو دڵەم کەزۆر پێوەی بەندبوو، شەقارشەقار و برینێکی خوێن لێرژاوی لێهات. ئەو گەڕایەوە ئەفەریقا و پەیمانی دایە تۆ قەتاو قەت لەگەڵ پیاوێکی دیکەدا نەژی. کوڕەکەمانی لەلای من دانا، وەلێ من،



پیاوێکی خەمبار، نەمتوانی دەرسێك لەو وەربگرم. کاتێ بیرم کردەوە هێشتا دەبێ دووساڵ سەبرم هەبێ تا لەگەڵ ئەو کیژۆڵەیەدا کە داوامکردبوو هاوسەریی بگرم، توانای هەدادانم نەبوو. ئەمەش لەبەر ئەوەی، لەگەڵ ئەوەشدا تێڕوانینێکی باشم لەسەر هاوسەرگیری نەبوو، کۆیلەی ئارەزووەکانیشم بووم. لێرەوە ئافرەتێکی دیکەم هەڵبژارد، وەلێ نەك لەپێگەی هاوسەردا. ئابەمجۆرەش (هەر) نەخۆشییە رۆحییەکەم چاکتر نەبۆوە، لەراستیدا بەهۆی خووە کۆنینەکانمەوە و لەکاتێکدا چاوەڕێی ژنهێنان بووم، خراپتریش بووم)[٩٥].

تا ئەوکاتەی دانپیانانەکانتم نەخوێندبۆوە، ئاگاداری ئەو ئافرەتەی دی نەبووم. دەبێ چەندە شەرمەزار بووبیت، چونکە بڕیار بوو من خۆم نەدەم بەدەست پیاوێکی ترەوە. خراپ نییە لەو بارەیەوە زێتر بزانین، ئەوەتا تۆ بەڕوونی دان بەوەدا دەنێی بەهۆی ژنهێنانتەوە نەبوو کە من لەوێ دوورخرامەوە. ئایا وا باشتر نەبوو منیش تا ئەو کاتەی چاوەڕێ بوویت ئەو کچۆڵە بێچارەیە بگا بەتەمەنی شووکردن، لەلات بمێنمەوە؟ وەلێ تۆ هەرگیز مەیلی ژنهێنانت نەبوو، تەنێ دەتویست رۆحی خۆت لە گەندەڵبوونی هەمیشەیی رزگار بکەیت، کەچی لەلایەکی ترەوە پیاسەیەکی زۆر سرووشتیانەت بەناو (مەیلە نەفسانییەکان)دا کرد و هەڵبەت ئەمجۆرە شتانەش دێنە پێش. ئۆڕڵی نەگبەت، ئێستێ هێواش هێواش تێدەگەم بۆچی تۆ پێویستت بەدانپیانان هەیە، تەنێ تۆزێ لە جۆری هەڵبژاردنەکەیان ناڕاریم.

بەو جۆرەی نابینم مۆنیکا لەگەڵ نێچیرە تازەکەتدا رووی گرژبووبێ. ئەو لەوەدا سەرکەتوو بوو، پەیوەندی ساڵەهای ساڵی تۆ لەگەڵ ئافرەتێکدا بسڕێتەوە، کە لەدڵەوە

شت ویست. هەر لەبەر ئەوەش گەیشتنی هاوسەری دواتر بێگومان جێگرەوەیەکی ن بووە بۆ رازیی کردنی ئارەزووە جەستەییەکان (مەیلە نەفسانییەکان). پایەبەرز، دایکی تۆ خانمێکی بە سەبر و حەوسەڵە بوو، لەپشت سەری مردووشەوە نابێ جگە لەچاکە، باسی هیچی دی بکرێ. لە ئەنجامیشدا، ئەو، ستەمکارانە تۆڵەی خۆی سەبارەت بەوەی ئەو شەوە لەعنەتیە ئێمە لە ئەفەریقا لەنگەرمان گرت، کردەوە.

نووسیوتە: (ئەو برینەی کەپاش پچڕانی پەیوەندیم لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا کە لەگەڵم دەژیا، لەدڵم هات، تابڵێی سوتێنەر و زۆریش ئازاراوی بوو، پاشان چڵکی گرت و ئیدی کەمتر هەستم بەئازارەکەی دەکرد. وەلێ بارودۆخەکە تا دەهات پتر و پتر بێ هیوایانە دەبوو)[96].

پاشان بەردەوام دەبی: (تەنیا شتێ کە منی لە نغرۆبوون دەنێو زەلکاوی قووڵتری ئارەزووە نەفسانییەکاندا، دەپاراست، وێڕای هەموو هەوڵدانێکم بۆ گۆڕینی روانگەکانم، هەر ترس بوو لەمردن و رۆژی داوەریکردنی تۆ، کە هەرگیز لە دڵم نەهاتە دەر،.. ئەگەر لە ناخدا باوەڕم بەوە نەدەبوو کە رۆحی مرۆ لەپاش مەرگ درێژە بە ژیان دەدا و سزایەك لە پاداشتی ئەو کردارانەی دەیانکەین، لە گۆڕێ نییە، ئامادەبووم مۆڵەت بە ئەبیکۆر بدەم[97]. وەلێ ئەبیکۆر بڕوای بەمە نەبوو. دەمپرسی: ئەگەر بوونی ئێمە نەمر بوو و تواناییشی هەبوو دەنێو چێژە جەستەییە ئەبەدییەکاندا بژی، بەبێ ئەوەی لەوە بترسێ کە لەدەستیان دەدا، بۆچی نەماندەتوانی هەمیشە کامران بین؟ و بۆچی عەودالّی شتێکی دی بووین؟)[98].



ئەرێ بە ڕاست بۆچی لە عەودالّی شتێکی تردا بین؟ مەبەستم ئەوەیە: بۆچی بەدوای شتێکدا بگەڕێین کە بۆی هەیە نەبێت؟ نەختێ ئەو یۆنانییەم بیردەخەیتەوە کە لەقوماردا پارچە ئاڵتونێکی بردبۆوە و لەپاشانیشدا چونکێ دەیویست زۆرتری دەستکەوێ، هەموو دەستمایەکەی خۆی لەدەست دا[99].

ئۆڕلێ دیمەنێکی لە ڕاددەبەدەر بهێنە پێش چاوی خۆت کە پڕە لە مرۆڤ و گیاندار، رووەك و زارۆکان و شەراب و هەنگوین. لەم دیمەنەدا هەزارەڕێیەکیش هەیە. ئێستێ ئەی ئەسقەفی پاکژ، تۆیەك کە سەردەمانێ هاوبەشی مەست و خۆشەویستی ژیانی من بووی، وای دابنێ دەنێو ئەو هەزارەڕێییەدا گوم بوویت. ناتوانی پەتی ئاریادنە[100] بدۆزیەوە، ئەو پەتەی دەکارێ لەنێو پێچاوپێچی ئەو هەزارەڕێییەدا رێنوومایيت بکا و بەساخ و سەلامەتی بتگەیەنێتە ئەو بەهەشتەی تیایدا دەژیایت. وەلێ هەموو خوداناسانی مەسیحی و ئەفلاتوونییەکان دەنێو قووڵاییەکانی ئەم هەزارەڕێیەدا فەرمانڕەوایی دەکەن. هەر پیاوێ کە رێی دەکەوێتە ئەوێ ژمارەی وان زیاد دەکا، چونکێ هەریەکە لەوان بەهەڵە لەو بڕوایەدان کە هەموو شتێ لەدەرەوەی هەزارەڕێیەکە دەستکردی شەیتانە. ئەمێستا نۆرەی گومڕابوونی تۆیە، هێندەی نەماوە تا هیچت نەوێ لەوەی کە لەدەرەوەی هەزارەڕێیەکەیە. ئەوەتا تۆش چوویتە ناو ئەو دەستەیە لە خوداناسە مەسیحییەکانەوە و بوویتە یەکێ لەو ئادەمخۆرانەی کە دەنێو دڵی دەیجووری ئەو هەزارەڕێیەدان[101] یان دەبوو بمگوتبا بوویتە یەکێ لە راوکەرانی مرۆڤ[102]. تۆ ئەو ژنەت بیرناچێتەوە کە خۆشتدەویست، کەچی سوپاسی یەزدان دەکەی بۆ ئەوە کە لێی جوێ بوویتەوە، چونکە ئیدی نەماوە تا وەسواست کا.



...ی خەوەکانتدا کە (وێنەی ئەوشتانەی بەپێی خووە کۆنینەکانت بەرجەستە بوون، [بەر]دەوامی بەژیانی خۆیان دەدەن)[١٠٣].

بەشکم خودا بەزەیی پێتدا بێتەوە. بەڵکا ئەو لەو شوێنەدا بتگرێ کەتیایدا چۆن چۆنی دەستدرێژی دەکەیە سەر هەموو ئەفرێنراوەکانی. جارەهای جار لە دانیپیانانەکانتدا نووسیوتە لە دەمەی ژیاندا لەشوێنێ بووی تیایدا خودای لێنەبوو. وەلێ با گریمانەی ئەوە بکەین تازە وا کەوتوویتە سەر رێگای هەڵە. ئۆدیبیش کاتێ لە (دولفی)یەوە بەرەو (تبس) سەفەری کرد، لەو بڕوایەدا بوو رێگایەکی راستی گرتۆتە پێش. هەر ئەوەش هەڵەی خەفەتبارانەی بوو. هەر کات بگەڕاباوە بۆ (کۆرێنت)، بۆلای زڕباوانی، هەموو شتێ چەند قات باشتر دەکەوتەوە. ئۆرڵ، لەوەش چاکتر ئەوەبوو تۆش رێگای راستی قەرتاجنەت بگرتبا بەر. لێرە هێشتاکەش ئێمە دەتوانین ئەڤینی خودایی لە گوڵەکان و رووەکەکان و دە ڤینۆسیشدا بەدی بکەین.

حەزدەکەم سەرنجت بۆلای هەندێ پەیڤی هۆراس رابکێشم: (هەردەم دەبیرت بێ هەموو رۆژێ کە خۆرهەڵدێ بۆی هەیە دوا رۆژی ژیانت بێ)[١٠٤] هەڵبەت ئەوە دیار نییە کە ئەمڕۆ دوارۆژی ژیانی تۆیە، وەلێ هاتین و وادەرچوو. دەکرێ بەهۆی ئەم دەربڕینەوە وا بیر بکەینەوە کە لەپاش ئەمە ژیانێکی دی نییە لە بۆ رۆحی ئێمە. (ئەی) گوتاربێژی بەساڵاچوو، بۆی هەیە وابێت و ئەمێستاکەش داوات لێدەکەم جارێکی دیکەش ئەو فرسەتە دەپێش چاوبگری، ئەوەی کە رێی تێدەچێت ئەسقەفی هیپۆش هەڵە بکات.



*ژیان کورتە، زۆریش کورت*. رەنگبێ ژیانی مەش لێرەو لەم ساتەدا بێت، تەنێ لێرە و لەهەنووکەدا. ئەگەر وابێ، ئایا پشتت نەکردۆتە ئەو رۆژانەی، کە وێڕای هەموو شتێ هێشتاکەش دەدرەوشێنەوە و لەنێو هەزارەڕێی تاریك و نووتەکی بیروڕا و تیۆرییەکاندا رێگەت لێ گوم نەبووە، شوێنێ کە ئیدی دەستم ناتگاتێ تاکو رێنماییت بکەم؟

ئۆرڵ، ئێمە تاهەتایە ناژین. ئەمە بەو مانایە نییە کە نابێ سوود لەو رۆژانە وەربگرین کە لەبەر دەستماندان.

وەلێ سەبارەت بە رۆحی خۆت، کە زیاتر لەهەر شتێ خۆشت دەوێ، لەدوماهیی کتێبی شەشەمدا نووسیوتە: (بەهەر لایەکدا گێنگڵێدا، بەرەو پشت، بەرەو ڕوو، لەسەر زگ، هەموو شوێنێ زەحمەت بوو، هێوریی تەنێ لەپاڵ تۆدا هەیە)[١٠٥].

جارێکی دی هەموو ئەو رۆژانەم دێنەوە بیر، هەموو ئەو شەوانەی پێکەوە لە قەرتاجنە بردماننە سەر. ئێمە لەپاڵ یەکدا کەوتبووینە ئارامییەکی قووڵەوە. هەر ئەو دەمە بوو گوتت: (حەز دەکەم تۆ لەهەر کوێ بیت، منیش لەوێ بم). وەلێ بەم پەیمانەت وەفا نەکرد. بەوێنەی دزێ خۆتت لەمن جوێ کردەوە و لە پێچ و پەنای خوداناسیی مەسیحاییدا گیرت خوارد بەبێ ئەوەی پەتی رێنماییکردنی منت لە دەستدا بێت[١٠٦].

کتێبی حەوتەمینت بەم گوتانە دەستپێکردووە: (ئێستا ئیدی سەردەمی پڕ گوناهباریی گەنجێتی و پڕگوناهکاریم کۆتایی هاتبوو و پێم نابووە، نێو ساڵانی



...ەوە. وەلێ هەرچەندێ زیاتر دەکەوتمە تەمەنەوە، زۆرتر شەرمم لە بێ هەمی خۆ دەهات)[١٠٧].

بڵند پایە، گوناهکاری یانی چی؟ بەدکار کێیە؟ یان بێ بەرهەمی؟ ئایا ئەمانە هەموو ئەو شتانە نین کە ئێمە لە پەروەردگار جوێ دەکەنەوە؟

لەدرێژەدا دەڵێی: (وێناکردنی واقیعیەتێکی دی جگەلەوەی بەچاوانی خۆم دەمدی، ئیمکانی نەبوو)[١٠٨]. باشە ئێستێ وەهای بهێنە پێش چاو کە واقیعیەتێکی دی نییە. لەو حاڵەتەشدا بەرەو رووناکایی وەرنەچەرخاوی، بەڵکو لێی دوورکەوتوویتەوە. ئاخر ئۆرڵ، مەگەر گەلایان بە درەختەکانەوە نابینی؟ ئایا هێشتاکە دەتوانی دنیایەك لەدەوروبەری خۆت ببینی؟ دەتوانی خۆت کوێر کەیت، هەرچەندە ئەمە بەبڕوای من کفرێکی تەواوە.

کەمێ لەوە دواتر دەنووسی هێواش هێواش بەڕوونی و سادەیی زانیت (ئەوەی دەگەنێ گەنیوترە لەهەموو شتێ کە ناگەنێ)[١١٠]. دان بەوەدا دەهێنم کە ئەمە قسەیەکی ئاوەزمەندانەیە، بەهێز و پەسەندکراوە. هەرچەندێ ئەو پرسیارەی دێتە پێش ئەمەیە، ئایا، بەلەبەرچاوگرتنی هەموو لایەنێك، شتێ بەناوی (نەگەنیو) هەیە کە رۆحی مە پەنای بۆ بباو ئەگەر نەبێ، بەبڕوای من عەوداڵبوون بە دووی نەگەنیوەکاندا بێ ماناترە لەگەڕان بەدوای شتە گەنیوەکاندا. باشە، من وای دادەنێم تۆ هێشتا چاوت نەکردۆتەوە و هێشتاکە لەسەر رێگای ئەسقەفی هیپۆ لەپێناوی مەلەکووتی یەزداندا خۆتت نەخەساندووە. ئۆرڵ، ببوورە، وەلێ ئەمە جگە لە شۆر و شەوقی شاعیرانە زیاتر، هیچی دی نییە.



دیسانەوە لەهەمان باسدا ئەوەی بەچاوی گیان دیتووتە و بۆ ئەو شتەی جەستەیەکی نییە، عەشقی خۆت دەردەبڕی. وای ئۆرڵ، پشتم شکا. کەسێ بهێنە پێش چاوی خۆت تەنێ بەو هۆیەوە کە بەگوێی رۆح نەغمەیەکی جوانتری گوێ لێبووە، دەتوانێ نەغمەی پەڕەندەکان بێدەنگ کات. یاخود کەسێکی دی لەبەرچاو بگرە کەتوانای هەیە تەواوی گوڵ و دارەکان وشك بکا چونکێ بۆنێکی پەسەندتری بە کەپووی رۆح بۆنکردووە. دیسانەوە کەسێکی دی بهێنە بەرچاوی خۆت کە دەسەڵاتی هەیە گشت ماڵ و بەرهەمێکی هونەری لە سەراپای جیهاندا نغرۆ بکا، چونکی هەموو ئەڤینی خۆی لە گرۆی شتە نامادییەکاندا، داناوە.

پەڕەندەکان لە بۆ من بێدەنگ بوون. گوڵەکان رەنگاورەنگیی پێشوویان نەماوە، کەسێ نییە پرچم بۆنکا و هیچ کەسێ منی لە ئامێز نەگرت. بەم شێوەیە، بەچاو پۆشین لەهەر شتێ منیش بوومە هاوبەشی چارەنووسی دیدۆ. وەلێ هەرگیز ئەمووستیلە هەڵکۆڵراوەکەت، کە ئەوەتا لەقامکمدا، دانانێم.

## سیپارەی هەشتەم

لە کتێبی هەشتەمدا دەکەویتە باسکردنی باوەڕهێنانی خۆت، لە میلانۆ، ئاخر چاوپۆشی لەهەر شتێ بکەین، ئیدی تۆ ئارامیت وەدەستهێنا بوو. نووسیوتە: (لەم کاتەدا باوەڕم هێنا بوو بەژیانی ئەبەدی لە تۆدا، هەر چەندەش لەو دیو شووشەیەکی تاریکەوە تەماشاتم دەکرد[111]' وەلێ (تازە) ڕزگار ببووم لەهەموو ئەو گومانانەی سەبارەت بە بوونی هەبوویەکی نەمر هەمبوون، ئەو بووەی کە گشت زیرۆحێ بوونی خۆیان لەوێوە بەدەست دێنا)[112]

زۆر چاکە، ئۆرلی ئازیزم، بۆی هەیە ئەو بووە نەمرەی کە سەراپای جیهان و هەرچی دەوێدا هەیە، دروستیکردووە، لەوانەش ئافرەتان و منداڵان، بوونی هەبێ. وەلێ ئەوەی من هەراسان دەکا ئەو ئەنجامەیە کە لە باوەڕی خۆتەوە بەدەستی دەهێنی.

نووسیوتە: (لەبەر ژیانی دنیاپەرستانەم لەخۆم ناڕازی بووم کە وەك قورساییەك ئەمنی بەرەو لیتاوی کێشدەکرد)[113]. پاشان روونیدەکەیەوە مەبەستت لە ژیانی دنیاپەرستانە چییە: (من هێشتا بە توندی گیرۆدەی ئەڤینی ئافرەتان بووم، پۆڵسی راسپێردراو ئەمنی دە ژنهێنانێ نەگێڕابۆوە، بەڵان تەماحی شتێکی لەوە زیاتریشی دەبەرم نابوو و گەرەکیشی بوو هەموو پیاوان چاوی لەوی بکەن و (خۆیان بخەسێنن نەبا گوناهان یەخەیان بگرێ). وەلێ چوون ئەمن پیاوێکی نەفس لاواز بووم،



هەڵوێستێکی ئاسانترم هەڵبژارد. هەر ئەوەش بەتەنێ بووە هۆی ئەوەی بێ ئۆقرە ئەمبەرە و بەرێ بکەم. نەخۆشکەوتم و خەمی پڕووکێنەر دە دەروونێمدا پەنگیان دەخواردەوە)[114]. کەمێ دواتر درێژەی دەدەیە: (بەمجۆرەش دوو ویست لە دەروونێمدا رووبەڕووی یەکدی وێستا بوون، پێویستییەکی کۆنینە و یەکێکی نوێ، پێویستییەکی جەستەیی و یەکێکی رۆحی. ئەم کەشمەکەشە زەینمی دوولەت کردبوو)[115].

هەر لەو کاتەیدا بوو نامەیەکت بۆ هەناردم، و تیایدا بەڕوونی دڵتەنگی خۆت سەبارەت بە دووریمان لەیەکدی، باس کرد. وەلێ پێویست ناکا لەبابەتی ئەو نامەیە خەم داتگرێ، ئەوەیان نیشانی قەشەی نادەم.

دانپیانانەکانت ئاوا بەردەوامی وەردەگرن: (ئاواهی و بەشێوەیەکی دڵپەسندانە دەگەڵ ئازارەکانی دنیادا خۆم راهێنا بوو، وەك کەسێ کە دەخەودایە. ململانێشم لەگەڵ بیروڕاکانی ئەتۆدا بەوێنەی هەوڵدانی کەسێ بوو کە دەیەوێ بێدار بێتەوە، وەلێ هێندە ماندووە، دیسانەوە خەوی لێدەکەوێتەوە. ئەوە سرووشتییە کە هیچ کەسێ حەز ناکا هەردەم خەوی لێبکەوێ. لەگەڵ ئەوەشدا، کاتێ ئازای ئەندامان قوورس و تەمبەڵ بوون، زۆرینەی جاران دەمانەوێ خۆ رزگارکردن دەو قورسی و تەمبەڵییە دوا بخەین و بەپەسەندی دەزانین لە خەودا بمێنینەوە، هەرچەندە ئیدی کاتی بێدار بوونەوە هاتووە و تازە چێژ لەخۆ تەمبەڵکردن وەرناگرین. ئا بەمجۆرەش، دڵنیابووم باشترە تەسلیمی ئەڤینی تۆ ببم نەك فریوی مەیلە نەفسییەکانم بخۆم)[116].

لەدرێژەی (قسەکانتدا) نووسیوتە کە خواوەند چۆناهی لە بەندی هەوای نەفس رزگاری کردی، دوعات کرد: (پەروەردگار: پاکژی و داوێنپاکیم پێ ببەخشە، وەلێ نە هەنووکە. چونکێ ترسم لەوەیە وەڵامگۆی دوعایەکم بی و یەکسەر رزگارمکەیت لە

خۆشی و ئارەزووە نەفسانییەکان. من دەمویست ئەو ئارەزوانە تێر بن تا ئەو دەمەی نگاو کۆتاییان بێت... من بە هەموو بوونمەوە ئارەزوومەند نەبووم، لەگەڵ ئەوەشدا بێ ئارەزووش نەبووم)[١١٨].

سەرئەنجامیش بووکی تازە هات و تۆی لە ئامێز گرت، (قەشەنگ و مەست، وەلێ شادمانییەکەی هەر لەخۆڕا نەبوو)[١١٩].

هێندە کەوتوومە ژێر کاریگەرییەوە خەریکم پیرۆزبایت لێبکەم، چونکێ بەمانایەك تۆ ژنت هێنا، زەماوەندت لەگەڵ شازادەیەکی نادیاردا کرد و بەچاوپۆشین لەهەر شتێکێش، ئەو کەسێ بوو ئەتۆ تامەزرۆی ببوویت. بەمجۆرەش دەتتوانی ژن بهێنی بەبێ ئەوەی ناچار بیت ئافرەتێکی نوێ بهێنیتە ناو ماڵی دایکتەوە. کەوابێ ئەو سەرکەوت، دەبێ چەندێ دڵخۆش بووبێ، (تۆش) بۆ شاردنەوەی ئەم راستییە هیچ تەقەللایەك ناکەی. ئەو، هاوکات ژنی بۆ هێنایت و تەعمیدیشی کردیت.

سەبارەت بە کەفوکوڵی هەستەکانی خۆت لەپاش باوەڕهێنان، (خەریك بوو بنووسم لەپاش ژنهێنان)، دەنووسی: (ئەو دەم تۆفانێکی بەهێز هەڵیکرد و لەگەڵ خۆیدا لافاوێ ئەشکی هێنا. بۆ ئەوەی رێ بدەم ئەسرینەکانم بەساناهی برژێنە خوارێ، هەستام و لە ئالیپیۆس دوورکەوتمەوە. ئەگەر بڕیار بوو دابکەمە گریان، حەزمدەکرد لە تەنیایدا ئەو کارەی بکەم. تا توانیم لێی دوورکەوتمەوە بۆ ئەوەی شەرمی لێنەکەم. لەو ساتەدا ئەوە هەستی من بوو، کە ئەویش پێی زانیبووم. وەك ئەوەی شتێکم گوتبێ و ئەمەش دەری خستبێ وا گریان لەگەروومدا قوڵپ دەدا. ئەمەبوو هەستام، ئالیپیوس دە جێگای خۆی نەبزوا، دەنێو سەرسووڕماندا حەیران و سەراسیمە ببوو. بێ ئەوەی بزانم چی دەکەم، خۆم گەیاندە ژێر دارهەنجیرێ و ئیدی جڵەوی فرمێسکانم



بەرەڵڵا بوو. لەچاوانم بارانی بەهاری دەباری، وەك ئەوەی خۆشەویستێکم بۆ تۆ کردبێتە قوربانی)[١٢٠].

ئاواهی، کەوابێ جارێکی دی پەنات بۆ ژێر دارهەنجیرێ برد و بەمانەیەك بازنەکەت تەواو کرد. حەتمەن دەبێ بیرت لە دارهەنجیرەکەی قەرتاجنە کردبێتەوە. لە منت پرسی: (تا ئێستا چوویت بۆ رۆما؟). کاتێ بیر لەمە دەکەمەوە، شانم دەلەرزێ، چوون دەبەر رۆشنایی دانپیانانەکانتدا، ئەوەی لەوە پاش روویدا وەك پێشبینییەك وایە. ئایا بۆی هەیە لەو لافاوی ئەشکەی لەچاوانت رژا، چەند دڵۆپێکیشی دەپێناوی مندا بووبێ؟

تا ئەو دەمەی دەژێر دارهەنجیرەکەدا ئەژنۆت شل بوون، ئاینیاس عەردی مژدەپێدراوی نەدۆزیبوەوە. ئەمێستاش تەواو ببوو: هەموو شتێ بەسەر ئەڤیندا سەرکەوتبوو[١٢١].

نووسیوتە: (پاشان چوویت بۆلای دایکم. پێمانگوت چی روویدا... ئای چەنێ کامەران بوو... چونکە تۆ ئەمنت بەرەو لای خۆت بانگ کردبوو، ئێستاکەش نە ئارەزووی هاوسەرم دەکرد و نەهیچ شتێکی دی کە لەم دنیایەدا بڕوام پێی بێت. ئیدی من لەسەر لقی ئەو داری بڕوایە وێستابووم کە ساڵانێکی پێشووتر ئەو منی دەخەونیدا بەسەرەوە دیتبوو. ئەتۆ خەمی ئەوت کردبووە گەشکە، گەشکەیەکی زۆر زیاتر لەوەی ئەو بۆ خۆی بەخەیاڵیدا دەهات و زۆریش رەسەنتر و بەنرختر لەشتێ کە سەردەمانێ چاوەڕێ بوو لە رێگەی وەچەی پشتی منەوە بێتە دەستی)[١٢٢].

ئێمە بۆ خۆمانین، ئایا لەو بڕوایەدا نیت بۆ کردنەدەرەوەی بەزەبری ئادیۆداتۆس لەم بازنەیە، کەمێ پەلەت کرد؟ ئاخر تۆ لەو کاتەدا شتێکت لەبارەی چارەنووسە



مب[illegible]کەیەوە نەدەزانی؟ نەڵێیێ ئەو کوڕیژگە بێچارەیەش لەو تەمەنەیدا ببووە [illegible]ێنپاك؟ یان لەوەش زیاتر، نەڵێیێ کە بەهیچ جۆرێ ئەوت بەکوڕی خۆت نە دەزانی؟ راستە، ئەو زۆڵ و حەرامزادە بوو، ئێمەش هێشتاکە نەگەیشتووینەتە دوا پەردەی مەرگەساتەکە.

لەمەڕ سەفەری گەڕانەوە لە مووچەی دەرەوەی شارەوە بۆ ڤێرکۆندوس، دە کتێبی نۆیەمدا نووسیوتە: (دەگەڵ خۆماندا ئادێوداتۆس، کوڕە راستەقینەکەم و بەرهەمی گوناهەکانم برد. خودایە ئەتۆ لەبەرامبەر ویدا کۆتایت بە لوتفی خۆت هێنابوو. نزیکەی پازدە ساڵ لەتەمەنی رابردبوو. ئەی پایە بڵند، سووپاسی مەرحەمەتت دەکەم، تۆ ئەفرێنەری گشت کایینات و توانات هەیە گوناهەکانمان بگۆڕییە شتی قەشەنگ و زێبا. چونکێ قیسمەتی من دەو کوڕەیدا جگە لە گوناه شتێکی دی نەبوو. ئەو پەروەردەیەش کە لە سەرەتای منداڵییەوە پێمان بەخشی، تەنێ و تەنێ ویست و بەزەیی تۆ بوو. ئەمن سوپاسگوزاری تۆم، خودایە)[۱۲۳].

پاشان لە نووسین بەردەوام دەبی: (پەرتووکێکم بە نێوی (فێرکار)ەوە نووسیوە و ئەمەش گفتۆگۆیەکە دەنێوان من و ئەودا. ئەتۆ بەخۆت دەزانی سەراپای ئەو بیروڕایانەی هاودەمەکەم دەیانخاتە ڕوو، لە ڕاستیدا ئەو هزرانەن کە ئادێۆداتۆس لە تەمەنی شازدە ساڵاندا خاوەنیان بوو. ئەمن شتگەلێکی دیکەشم لێ بیست کە پڕبەهاتریش بوون. واقیعیەت ئەوەیە من لە بیرتیژی و زیرەکییەکەی لەرزم دەگرت و جگە لەتۆ چ کەسێ دەتوانێ موجیزەی وا بئافرێنێ؟ وەلێ چ زوو لە ژیانی دنیایەت بردەوە. کەواتە بۆم هەیە و (دەتوانم) بەبێ مەراق و بە خەیاڵێکی ئاسوودەوە بیر لە منداڵی، گەنجێتی و هەموو ژیانی بکەمەوە)(۱۲٤).



ناتوانم ئەوە بشارمەوە کە خوێندنەوەی ئەم دێڕانە چەنێ دڵیان ئازار دام. منیش لەرزم گرتووە، وەلێ لەبەر هۆیەکی دی. ئەمن نازانم ئایا خواوەند ئادیۆداتۆسی لەژیان مەحرووم کرد، یان کەسێکی دی. (هەڵبەت) لەمبارییەوە هیچ بیروڕایەکم نییە. هەر ئەوەندە دەزانم کە ئەوەی لە دایکی جوێکردەوە تۆ بوویت. پایە بڵند، ئادیۆداتۆس تاقانەی من بوو، مەگەر ئەوکاتە لە دەستمان نەچوو کە تۆ چاودێریت دەکرد و جوانە مەرگ بوو و هەردووکمانی بە تەنیا بەجێهێشت؟

دەبێ ئێستێ چەندە مەست و بێ خەم بێت، کە (وابیرکەیەوە) نەکا ئادیۆداتۆسیش بەهۆی ژنێکی بە ئالۆشەوە ڕاپێچی ژێر دارهەنجیری کرێ. من بۆخۆم زیاتر مەراقی ئەوەم هەبوو نەکا ئەویش ڕۆژێ لەبەرامبەر داوێن پاکیدا چۆك دابدا- بەوێنەی کۆیلە و مێردێکی زەلیل ژن[۱۲٥].

## سیپارەی نۆیەم

لێرەدا چاو لەخۆت دەکەم و خۆم لە گێڕانەوەی زۆرشت دەپارێزم تا خێراتر بگەمە ئەو خاڵانەی مەبەستمن. ئەمە جگەلەوەی نیوەی سەرمایەکەی خۆم لە کڕینی کاغەزی پۆستدا دانا و (ئەمێستاش) لەچەند وەرەقەیێ زیاترم نەماوە!

لەرێگای هاتنەوەتدا بۆ ئەفریقا لە قەراغ ڕووباری (تیبر) گەیشتییە ئۆستییا. تۆ و مۆنیکا لەوێ (گفتوگۆیەکی سەرنجڕاکێش)تان هەبوو، کە ویستت تیایدا هەوڵبدەی تاکو (خودی ئەو ژیانە نەمرەی قەدیسەکان دەبنە هاوبەشی) ئاشکرا بکەی. ئەو گفتوگۆیە گەیاندتیە (ئەو ئەنجامەی کە زۆرترین ئەو چێژەی کە هەستە جەستەییەکان، لە بڵندترین لوتکەی درەوشاوەی زەمینییدا دەیهێنێتە دی، تەنانەت ناگەنە پێگەی بەراورد کردنیش بە ژیانی نەمریی، چ جای ئەوەی بخرێنە ڕوو)[١٢٦]

لەم پێ ڕاکێشانەم ببوورە، پایە بڵند، وەلێ من ئەمێستاکە ژنێکی خوێندەوارم، بەردەوامیش بەو پەڕی سینەفراوانییەوە هەستدەکەم پێویستە خاڵێکت وەبیرخەمەوە، ئەویش ئەمەیە کە فەرمایشتەکانی تۆ زیاتر بە سیحر و جادوو دەچن. وامان دانا سەبارەت بەم خاڵە تایبەت و چارەنووسسازە کەوتوویە هەڵەوە؟ ئەو دەمەی هێشتاکانێ دەگەڵ یەکدا بووین، گوتت کە خەڵاتەکە دەدەیە (ئەبیکۆر). ئەمن بەخۆم



بڕوام وایە ئەگەر بۆ خۆتبا، ئەوە یەکسەرە بە هاوەڵی ئادیۆداتۆس دەگەڕایەوە بۆ قەرتاجنە. چوون لەو بارەیدا هیچ چارەیەکی دیکەت نەدەما و ناچار بووی وەك مرۆیەکی خەملیو، لێرە و لەم ساتەدا بژی و ئەوساش لە ئەوینێکی خاکەڕای زیاتر بەرخوردار دەبووی، کە دەتوانی دەگەڵ ئەمن و خەڵکانی دیکەدا بەشی بکەی.

*ژیان هێندە کورتە ئێمە کاتی وەهامان نییە لەبارەی ئەڤینەوە داوەری مەحکوومکەرانە بکەین. ئۆرل، دەبێ مرۆیەکان سەرەتا بژین، ئەودەم فەلسەفە بهۆننەوە.*

هەڵبەتا دەژێر هیچ هەل و مەرجێکدا نابێ مۆنیکای لەبیر بکەین چونکی لە ئۆستیا بوو، لەرزی لێهات و دە جێدا کەوت. تۆش دەنێو قسە بە پەلەکانیدا لەگەڵ هاوڕێ و ئاشناکانی گوێت لێببوو کە (بەپشتبەستنێکی دایکانە، سەبارەت بە نەفرەتی لە ژیان) ئاخاوتبوو، و گوتبووشی: (مردن چەنێ باشە)[١٢٧]

مرۆیەکی دامەن پاك بوو، ئەو- مەبەستم ئەوەیە مادام توانیبووی ڕقی لەم ژیانە ببێتەوە، ببووە داوێنپاك- لەگەڵ ئەوەشدا، ناچارم ئەوەش بڵێم وا دەردەکەوێ تۆش ڕقت لە ئافەریدەی یەزدان ببێتەوە، چونکە ئێمە نازانین کە خوداوەند جیهانێکی دیکەی بۆ ئێمە خوڵقاندووە. دەزانم خەریکە قسەکانم چەند بارە بکەمەوە، وەلێ قەشەی بڵند پایە ڕەنگە ئەمە لەبەر ئەوەی بێ کە ئێوەش دەنێو دانپیانانەکانتاندا جارەهای جار خۆ و چەندبارە دەکەیەوە. ئەمن لەو باوەڕەیدام ڕەتکردنەوەی ئەم ژیانە جۆرێ لە ڕقبوونەوەیە لە مرۆڤ -ئەوەش دە بەرژەوەندی بوونێکی تردا کە ڕەنگە لە شتێکی زەینی زێتر نەبێ. بێگومان ڕەخنەکانی ئەرستۆت سەبارەت بە دونیای نموونەیی لەبیر نەچوونەوە؟

***ژیان گەلێ کورتە. ئێمە ئازادین بیر لەژیانی پاشی وەی بکەینەوە، وەلێ مافی ...مان نییە دەگەڵ خۆمان و کەسانی تردا بەدڕەفتاری بکەین، نەکەم و نەزۆر (بۆمان نییە) ئەوانی دی وەکی هۆکارێك بۆ گەیشتن بە دونیایەکی دی کە هیچی لە بارەوە نازانین، دەکار بهێنین.*** وێڕای ئەوەش ، گریمانەیەکی دیکەش لە ئارادایە کە تۆ لە هیچکام دە کتێبەکانتدا گرنگی وێنادەی. حەقی خۆی بوو لە پێگەی گوتاربێژێکی پلە بەرزدا بەلای کەمەوە لە ئەگەری هەبوونی ژیانێکی نەمر بۆ ڕۆحە تاکەکانت بکۆڵیباوە و هەروەها ئەوەشت ئاشکرا کردبا ئاخۆ جیاوازیی نێوان زەمینەکانی داوەریکردن لەگەڵ ئەو شتانەی تۆ بەحەقیان دەزانی، لە چیدایە. بۆ نموونە، بە بڕوای من ئەوەی بڵندمەقامێ پەیوەندییەکی ئەڤیندارانەی دەگەڵ ئافرەتێکدا هەبێ، گوناهێکی گەورەتر نییە لەوەی دایکێ لە منداڵە تاقانەکەی جوێ وەکەی. ئەمن بەخۆم چێژ دەو خەیاڵەی دەبینم کە تیایدا ئەو خوایەی عەرد و عاسمانانی دروستکردوون، هەمان ئەو خودایەیە کە ڤینۆسیشی خولقاندووە. ئەو دەمەت بیر دێتەوە کە زگپڕ بووم؟ یان ئەو دەمەی زارۆکەکەم لە مەمکانم شیردەدا؟ تەنانەت ئەو دەمەش ئەمنت لەهەر ژنێکی دی لەلا پەسەندتر بوو.

ئایا دەو دەمەیدا لەهەر ساتێکی دی لە خودایەوە دوور بووی؟ من نالێم هیچ شتێ لەم شتانە دەزانم. قسەی من ئەوەیە کە دەڵێم نازانم. تەنانەت زبانم لاڵ بێ، نالێم باوەڕم بە داوەری و حوکمی خودایی نییە. ئەمن تەنێ دەڵێم بۆی هەیە و دەلوێ باوەڕیشم بە هەڵسەنگاندنی پشتکردنە هەمموو چێژەکانی جیهان و ڕەتکردنەوەی هەمموو گەرمی و نەوازشەکانیش لەلایەن ئەسقەفی (هیپۆریکۆس)ەوە هەبێ. هەر ئەمەش دانپیاهێنانەکانی منە.



لەپاشان مۆنیکا لە تەمەنی پەنجا و پێنج ساڵی و لە ڕۆژی نویەمینی نەخۆشییەکەیدا، ئەو ڕۆژەی ئەمن بوومە سی و سێ ساڵان، گیانی خۆی تەسلیمی گیان بەخشان کردووە، ئۆڕلێ. ئەمجا ئەو دەم (ئەم ڕۆژە پاکژ و باوەڕدارە لە جەستە خاکییەکەی جوێ بۆوە)[١٢٨]. نووسیوتە،(ئەو کاتەی دوا هەناسەی هەڵکێشا ئادیۆداتیۆسی کوڕم، بە دەنگی بەرز کەوتە گریان.) وەلێ تۆ هەستت کرد (ئەو ئەسرین و گریانە شایەنی ماتەمی و ئۆغر کردوو نەبوو). ئەگەر چی بۆی هەیە ئەو کارە لە پێناوی مردووەکان و لەبەر چارەنووسی بڕیار لەسەر دراویان، یاخود بەو هۆیەی کە مەرگی وان لە ڕواڵەتدا جۆرێکە لە نەمانی هەمیشەیی، کارێکی گونجاویش بێت. وەلێ مردن لەبۆ دایکت بەدبەختی نەبوو، لەڕاستیدا مەرگ نەبوو.)[١٢٩].

خودا لە ڕۆحی خۆشبێ، ئەسقەفی ئازیز. نایشاریتەوە کەبۆ خۆشت هەستت بە ئازار دەکرد، ئازارێکی تاڵ و بریندارکەر، هەر ئەوەندەش کە بەتەنیا مایتەوە، جڵەوی ئەسرینانت شلکردن تا داباریێن. ڕاستییەکەی ئەوەیە کەمێ شەرمت دەکرد لەبۆ مەرگی دایکت ئەسرینان بڕێژی، ئەدی لەوانە بوو ئەو گریانەت بە نیشانەی پەیوەستبوونت بە هەستە خاکییەکانتەوە بزانن.

لەبیرت دێ ڕۆژێ لەبارەی خۆپەرستی قارەمانە یۆنانییەکانەوە دەدواین؟[١٣٠] وا بیر دەکەمەوە بێ جێ نەبێ لێرەدا وەبیرت بهێنمەوە کە تۆش تەنێ مرۆیەکی[١٣١] ئاخر، ئۆڕلێ، تاکەی دەتەوێ سەبر و هەدادانی من تاقی بکەیەوە[١٣٢]. هەرچەندە بهێنی و ببەی و خۆت لوول کەی، ئەتۆش خاوەنی (هەستە خاکییەکانیت)، هەڵبەت ئەگەرەکو

[...]ستێ لە ویژدانتدا مابێ. ئەرێ بەڕاست ئەو هەستە تایبەتانەی ئێستەکێ هەتن، [...]یان چییە؟

پاشان نامەی دووەمم لە ئۆڕلی خۆمەوە پێگەیشت...

دوای ئەوەی مۆنیکا لە ئۆرستیا[١٣٣] بە خاك سپێردرا، لەگەڵ ئادیۆداتیۆس چوویت بۆ ڕۆما و نزیکەی ساڵێ لەوێ مایتەوە. وەلێ قوربان لە دانپیانانەکانتدا لەبارەی ئەو ساڵەوە شتێ نانووسی، بۆچی؟ ئایا تەنانەت پێویستی تۆ بە دانپیانانیش سنوورێکی هەیە؟

سیسەرۆ نووسیویە، دانپیانان دەرمانێکە بۆ ئەو کەسانەی تووشی لادان بوون[١٣٤] کەچی ئەوەتا تۆ دان بە گەورەترین هەڵەکانتدا نانێی، ئەدی چۆن دەتوانی لەبارەی دوا پەرەی نومایشە تراژیدییەکەوە پێنووست دەکارخەی؟ چۆن دەتوانرێ شتێ لە تراژیدییەوە فێربین ئەگەر (ئەو)مان لادا.

لە ڕواڵەتدا، دە پاش مەرگی مۆنیکای دەبێ لەپڕ دووچاری حاڵەتێکی گومان و دوودڵی و بەتاڵبوونەوە بووبی. ئێستە بەتەنێ مابوویەوە، لەگەڵ کوڕێکدا، مۆنیکا چوو بوو و ئەتۆش دڵت لەبۆ من تەنگ ببوو، ئۆرڵ، دڵت لەبۆمن تەنگ بوو. ئادیۆداتۆسیش هەر دڵی لە بۆ من تەنگ بوو. (ئەودەم) دوو ساڵ بەسەر جوێ بوونەوەماندا ڕابردبوو. وەلێ بڕیار نەبوو هەرگیز من ببینێ و منیش قەتاوقەت ئەوم نەدی. دە نامەکەتدا نووسیوتە، مۆنیکا مردووە، لێرەدا نامەوێت بە هێنانەوەی قەولەکانی خۆت دە نامەکەتەوە، ئازارت بدەم، وەلێ تامەزرۆ بوویت خەبەرم بدەیتێ کە لەمێژە دەستگیرانداریەکەت هەڵوەشاوەتەوە و بەهیچ شێوەیەکیش خەیاڵی ئەوەت نییە ژنێ بێنی. لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە ڕستەی کۆتایی نامەکەت وەبیر بهێنمەوە. نووسیوتە: (فلۆریا، وەی کەچەندە



دڵم لە بۆت تەنگ بووە. خۆزگە دەتتوانی لەم دەمەیدا لەلای ئێمە بیت. مەیلی بینینتم هەیە، هەم دڵم دەیەوێ و لەهەمان کاتیشدا نایەوێ بتبینم. دەمەوێ، وەلێ ناتوانم، ناشتوانم، وەلێ مەیلم لێیە).

لەم بارودۆخەدا جاری وا هەیە زەحمەتە لەبۆ مرۆڤ بڕیار بدات، ئایا سەیرە ئەو بڕیارە گاهگاهێ هەڵە بێت؟ ئۆڤید (ovid) نووسیویە: (دەزانم چ شتێ لەبۆ من باشترە، وەلێ کارێ دەکەم کە بۆمن زیانی هەیە)[١٣٥]. لێرەدایە کە هێشتووتە ئادیۆداتۆسیش چەند وشەیەك بۆ دایکی بنووسێ. ئۆرڵ، چ میهرەبانییەکت نواند و چەندەش بە ترسەوە، چونکە بێگومان پاش ئەو هەموو دوورییە، بەخاتری ئەوەی نامەی لەبۆ من بنووسێ، چێژی وەرگرتبوو.

بیرکردنێکی دوولایەن بوو، منیش لە ناوەڕۆکی قسەکانتەوە ئەوە تێگەیشتم کە دەتەوێ مببینی. ئەوەبوو بەرەو ڕۆما هاتم، بەختم یار بوو، لەماوەی دوو سێ ڕۆژدا ئەسپابی سەفەرەکەم ئامادەبوون.

کاتێ بۆ دووەمین جار گەیشتمەوە ڕۆما، بەردەوام ڕستەیەك لە گوێمدا دووبارە دەبۆوە: (تا ئێستا چوویت بۆ ڕۆما؟) و ئەمجارەیان تاق و تەنیا بووم لەبۆ دۆزینەوەی ئاراستەی ڕێگایەکەش دەبوو لە خەڵکی بپرسم. وەلێ لەپاش چەند ڕۆژان سەرلەنوێ لە (ئاونتین) یەکترمان دییەوە و توانیمان یەکتری لە باوەش بگرین.

ماوەیەکی زۆر بەو جۆرە ماینەوە، بەتوندی نیگامان بڕیبووە یەکدی و تا دەمانتوانی لە قووڵایی چاوی یەکتر ورد دەبووینەوە. ئایا لەو کاتەدا وا نەدەهاتە پێش چاو کە ئێمە لە ڕۆحێ زیاتر نین، کە بەجۆرێ لە جۆرەکان لە خۆیدا عەکسی خۆی نیشان

ئایا؟ ئۆرڵ، لەپاشان شتێکت گوت کە دڵنیام لە بیرت نەچۆتەوە؟ گوتت، لێرە واوە دەبێ هەردەم لەلام بمێنیتەوە.

کاتێ بۆ چەند حەوتوویەکی کەم ژیانی هاوبەشی پێشوومان دەستپێکردەوە، تۆ (دانەرِمای). مەبەستم ئەوەیە لەپاش ماوەیەك ژیان دەنێو کەندرِی تاریکی خوداناسیی مەسیحیدا، سەر لەنوێ بووژایتەوە. ئەوەی لەو چەند حەوتوویەدا قەوما، شتێ نییە لە بەردەمی خودا، یان مرۆڤدا دانی پێدا نێی. تەنێ ئومێدی ئەوەم هەیە بەهۆی ئەو رووداوانەی کە پاشتر روویاندا سەبارەت بەو رۆژانە هیچت نەنووسیبێ.

لەبیرت دێتەوە ئەو دەمەی لە (فۆرووم) چوینە خوارێ و تەماشای بارینی بەفرمان کرد کە بەسەر تەلاری پاشاییدا دەهاتە خوارێ؟ هەستت کرد من سەرمامە، پاشان بەجۆرێ بەخۆتەوەت گوشیم، لەبیرت دێ گەرِامەوە و پێمگوتی شەرم ناکەی. وەلێ حەزم دەکرد لێتەوە نزیك بم، ئێمە هەردووکمان هەمان نیازمان هەبوو.

نەماندەتوانی دەژێر بانێکدا پێکەوە بژین، چونکێ بەلای کەمەوە هەر وەکو گوتت، حەزت نەدەکرد ئادیۆداتۆس لە سەرەتای گەیشتنمەوە من ببینێ. ئەمنیش لە تامەزرۆیی دیداری وی، وەخت بوو گیانم دەرچێ. وەلێ بیرت کردەوە ئەگەر بێت و روداوێ روو بدات و ببێتە هۆی تێکدانی ئەم جڤینە گەورەیە، زۆر بێ هیوا دەبی. ئەوەبوو ژوورۆکەیەکت لەسەرووی (ئاونتین)ەوە بەکرێ گرت، شوێنێ کە تەنێ ئەمن و تۆ دەمانتوانی لەوێ یەکتری ببینین.

ئۆرڵ، چۆن دەتوانین ئەو زستانە لەبیر بەرینەوە؟ جارێکی دی ئێمە لە قەڵەمرەوی ڤینۆسدا بووین و دەمانتوانی ئازادانە لەنێو ئامێزیدا یاری بکەین. ئەدی ئەوە تۆ



نەبووی کە گوتت واهەست دەکەی لە درەختێکی ژاکاو دەچی کە لەپرِ و لەدوای زستانێکی وشك و نەبراوە، بارانی پایزێ بووژاندبێتییەوە.

لەبەر پاراستنی ئابرووی تۆ نییە کە ئاوا بەکورتی ئەو رووداوانە بەسەر دەکەمەوە. پاش نیوەرِۆیێ، لەداوای دابەشکردنی دیاری ڤینۆس، بە تورِەیی ئاورِت لێ دامەوە. پاشان لێت دام. لەبیرتە چۆنت کوتام؟ ئۆرڵ، تۆ، تۆیەك کە سەردەمێ ئۆستادی رِێزداری زانستیی بەیان و مەعانیی بوویت، بەجۆرێ لێتدام کە لە بێهۆشی نزیك ببوومەوە، چونکێ رِێگەت دابوو نەرمی من دووچاری وەسواست بکا. ئەوە من بووم دواجار دەبوو لەبەر ئارەزووبازی تۆ سەرکۆنە بکرێم. پێشتر پەنام بۆ گوتەکانی هۆراس برد و ئەمێستاش بە خۆشحاڵییەوە هەمان کار دەکەم: (کاتێ مرۆیە گەمژەکان دەیانەوێ خۆیان لە هەڵە بەدوور بگرن، بەزۆری پێچەوانەکەی دەکەن).

لێتدەدام، هاوارت دەکرد، ئەسقەف.. چونکێ جارێکی دی دەبوومەوە مەترسییەك لەسەر رِزگاربوونی رِۆحی تۆ. پاشان لسێکت هەڵگرت و دیسانەوە کەوتییەوە لێدانم. وام دەزانی دەتەوێ تا مەرگ لێمدەی، چونکێ لەو کاتەدا هەمان ئەو ئەنجامەت دەهاتە دەست کەبەهۆی خەساندنی خۆتەوە بەدەستت دێنا. من لە خەمی گیانی خۆمدا نەبووم، وەلێ بەجۆرێ لە ئۆرڵی خۆم نائومێد و شەرمەزار و دڵشکاو بووم، کە رِێك وەبیرم دێ ئەو کاتە خۆزگەم خواست: ئەی کاش بۆ هەمیشە رِۆحم بکێشی و رِزگارم بکەیت.

تەواو ببوومە ئەو شتەی کە نەتدەتوانی بۆ رِزگاربوونی رِۆحت پشتم تێکەی. من ئەو پەزە خوێنلێرژاوە قوربانییە بووم کە بۆ کرانەوەی دەرگاکانی بەهەشت پێویست بوو.




پاش[illegible] داتە پڕمەی گریان، ئەمەم هەرگیز لە بیر ناچێ. دەستت لە لێدانی من [illegible]گرت، وەلێ چەند برینێکی خوێناویم پێوە بوون. تۆش گریای، دڵت دامەوە و داوای لێبووردنت لێکردم. لەبۆت ڕوون کردمەوە، ئەمێستا هەموو شتێ جیاوازە، ئیدی مۆنیکا لێرە نییە.

دەستەکانت پێکەوە گوشین و دەپاڕایتەوە ببەخشرێی، گاهێ لە من دەپاڕایتەوە و گاهێ لە یەزدانی تاك و تەنیا.

پەرۆیەکت دۆزییەوە و برینەکانمت پێچان. من هەستم بە سەرما و ترس دەکرد. سەرمام بوو چونکێ هێشتا خوێنم لەبەر دەڕۆیی، دەترسام چونکێ زەبر و زەنگێکم دیتبوو پێشتر هیچ بە خەیاڵمدا نەدەهات.

وەك بڵێی شتێکی تەواو نوێ سەری هەڵدابوو، سەردەمێکی تازە. سەردەمی کۆن، ئەو دەمانەی من و تۆ پێکەوە بەسەر پردی ڕووباری ئارنۆدا تێپەڕیبووین. پاشان چەند ساڵێ بەگومان و دوودڵی و پشێوی تێپەڕیبوو. ئەمجا ئەو کاتەی تۆ لەپڕ هێرشت کردە سەر من، سەردەمی نوێ دەستیپێکرد. وەلێ من تەنێ بیرم لە یەك شت دەکردەوە: (لە تۆ، ئۆرلێ، لەتۆ).

ئێدی منت ناردەوە قەرتاجنە، چیدی خەبەرم لێت نەما، تا دووساڵ لەوە دوا، دوای ئەوەی ئادیۆداتۆس جوانەمەرگ بوو.



## سیپاردەی دەیەم

ئەسقەف، شانۆییە خەماوییەکە کۆتایی پێهات. ئەمێستێ تەنیا دەبێ پەردەی کۆتایی (نیوە خوداکان)[١٣٦] پێشکەش بکرێ. هەر لەبەر ئەوەش من چەند گوتەیەکم لە کتێبی دەیەمی دانپیانانەکانتەوە هەڵبژاردووە. پێشتر چەندین جار ئاماژەم بەوە کردووە کە لەدەمی پاڕانەوەدا لە خودا بەهۆی هەستەوە، چۆن مامەڵە لەگەڵ هەست و تامەزرۆییدا دەکەی، چونکە ئیدی هیچ هەستکردنێکی خاکی لە بوونتدا نییە. هەرچەندێ لەبۆ تۆ سەختە خۆراکی ڕۆژانەت بەجۆرێ بەکاربێنی کە تەنێ بۆ پاراستنی سەلامەتیت بەس بێ، نە زیاتر. هەر بۆیەشە ململانێی ڕۆژانەت (لە شێوەی ڕۆژووگرتندا) هەڵبژاردووە تاکو (جەستەتت دەستەمۆ بکەی). نووسیوتە: (چونکە ئەمە شتێ بوو کە نەمدەتوانی یەکجار و بۆ هەمیشە بڕیاری لەسەر بدەم و هەرگیز نەچمەوە سەری، هەر وەکو ئەوەی دەگەڵ ئارەزووە نەفسانییەکاندا کردم).[١٣٧]

دیسانەوە هاتینەوە هەمان شوێن، چونکە ئەمە مەبەستم بوو. نووسیوتە: (پەروەردگارا، تۆ پەیوەندیت لە دەرەوەی هاوسەرداری حەرامکردووە و تەنانەت ئەگەر هاوسەرداری موباح بکەی، ئێمەت هانداوە ڕوو بکەینە شتێکی باشتر و

پێشەوە که پاکژیت بەخشییە من، ئەمە، تەنانەت پێش ئەوەی ببمە قەشەی ڕەسمە ئاینییەکانی تۆ، ڕوویدا. وەلێ لە بیرەوەری مندا کە زۆریشم لە بارەوە کوتووە، هێشتاکانێش وێنەگەلێ بە زیندوویی ماونەتەوە کە لە نەریەتە کۆنینەکانەوە وەرگیراون. ئەوانە خۆیانم بەسەردا دەسەپێنن، نەك هەرتەنێ بە هەموو هێزێکیانەوە دەهەنگامی بێداریمدا، بەڵکو لە خەوندا دووچاری وەسواسم دەکەن، نە تەنێ داوەتم دەکەن بۆ چێژپەرستی بەڵکو بۆ تەسلیمبوون و ئەنجامدانی کار. ئەم وێنا وەسواسکەرانە بەجۆرێ ڕۆح و جەستەی منیان داگیر کردووە، ئەوەی وا دەزانم بە خەون دیتوومە هاندەدا تاوەکو جێبەجێی بکەم، (ئەمەش) بە شێوەیەك کە هیچ شتێ لەوانەی لە واقیعیەت و بێداریدا دەیبینم ناتوانێ بەرەو ئەو تەسلیم بوونەم بەرێ. یەزدانی مەزن، پەروەردگارا، کەوابێ من خۆم نیم، خۆمم؟[١٣٨]

نا، ئۆرلێ، پێدەچێ ئەتۆ تەنێ سێبەرێك بی لەخۆت. پێدەچێ وا چاکتر بایە کۆیلەیێکی هەژاری سەر عەردی خاکی بووبای تا قەشەیەکی بڵند پایەی هەزارەڕێی تاریك و نوتەکی خوداناسیی مەسیحایی.[١٣٩]

جارێکی دی دەستە و دامێنی خودایەکەت دەبی تا یاریدەت بدا لە وەرامدانەوەی ئەم جۆرە پرسیارانەدا: (ئایا بەزەیی تۆ بەو ئەندازەیە نییە کە ئەم شەڕ و ئاژاوە پۆخڵەی کە تەنانەت دە خەونیشدا یەخەم بەرنادا، لەبەین بەری؟ پەروەردگارا، گومانم نییە لەوەی زیاتر و زیاتر بەزەیی خۆت بەسەر مندا دەبەشتییەوە تا ڕۆحی من- کە لەدوای ئارەزووەکان ڕزگار بووە، بتوانێ بەرەو تۆم ڕێنمایی بکا. لەو بارەشدا ئێدی ئەوەندە دەگەڵ خۆیدا نەدەکەوتە جەنگەوە و بەهۆی خەیاڵە ئارەزوومەندەکانەوە، دەخەودا جەستەی دووچاری ئەو شەرمەزارییە نەدەکرد تا بوار بۆ گوناە بڕەخسێنێ،



نەء، تەنانەت ئەوەیشی نەدەخواست. تەنێ لە دەسەڵاتی ئەنگۆدایە نەهێڵن ئارەزووی ئەو جۆرە شتانە بکا).[١٤٠]

ئۆرلێ بێچارە، هۆراس نووسیویە: ئەو کەسەی زۆری دەوێ، کەمتری چنگ دەکەوێ[١٤١] ئێدی تۆ لە پەنجا ساڵیی نزیك بوویتەوە پێویستە دان بەوەدا بنێم کە دەژێر کاریگەریدام، وێرای ئەوەش شانازی بە خۆمەوە دەکەم کە ئەوەندەم کاریگەری نەسڕاوە لەسەر تۆ داناوە. لەو ڕۆژە بەهارییەی قەرتاجنەدا، هەرگیز خەیاڵم بۆوەی نەدەچوو ئەڤینی مە ئەوەندە ئاگراوی بێ. وەلێ ناکرێ (مەیلە نەفسانییەکان) بەهۆی خۆپارێزی و جڵەوکردنی نەفسەوە، سەرکوت بکرێت، ئێدی ئێستێ عەقڵم ئا بەوەندەی دەشکێ. چونکێ گورگ تەنێ دەتوانێ پێستی خۆی بگۆڕێ، جەنابی پایەدار، ئەو ناتوانێ سروشتی خۆی دەستکاری بکا[١٤٢] یان بە گوتەی زەنوون: (بۆچی دەبێ هەڵاتن دە سێبەری خۆمان، هێندە دژواربێ؟)[١٤٣]

کەواتە بەو جۆرەی ئەگەر لەتامی خواردن و ئەوین چێژ وەردەگرین، پێویستە فێریش بین کە چۆن لێیان دوورە پەرێز بین. هەروەها نووسیوتە ئامادەیت بۆ هەمیشە خۆت لە وەسواسی هەستی بۆنکردن ڕزگار بکەی، پایەدار لەخۆم دەپرسم ئەدی لەبۆ ئێمە چ شتێ دەمێنێ، مەبەستم ئەوەیە لەسەر عەردێ، لێرە. ئەدی نازانی هەستی بیستنیش وەسواسی مەترسیدارانەی خۆی هەیە. نووسیوتە: (ئەو چێژەی لە گوێگرتن وەریدەگرین ناچاری کردبووم دەژێر قەمچییەکەیدا ملکەچ بکەم. وەلێ تۆ دەستت لێ بەردام، ئازادت کردم. دان بەوەدا دەنێم هێشتاکەش وەختێ گوێم لە ئاوازێ دەبێ کە ئەو قسەیەی تۆ ڕۆح و گیانی پێ دەبەخشێ و بە دەنگێکی خۆش و هونەرمەندانە

چڕین، هەست بە شادومانی دەکەم... بەمجۆرە گوناه دەکەم بەبێ ئەوەی بزانم، ێ لە پاشاندا هەست دەکەم کە گوناهە.)[١٤٤]

نووسیوتە جاری وا هەیە حەز دەکەی خۆزگە ئەو هاوارانەی لەگەڵ مەزامیرەکانی داود دان، نەتەنێ لەگوێی تۆدا، بەڵکو لە هەموو کەنیسەدا لادەبران و پاشان بەردەوام دەبی: (هەر لەم ڕووەیشەوەیە وادێت بە بیرمدا کە ئەسقەف ئاتاناسیۆسی خەڵکی ئەسکەندەرییە بەپێی ئەو شتانەی گوێم لێبوون، ڕێگایەکی پەسەندی گرتبووە بەر: ئەو سروودبێژی کەنیسەی ناچار کردبوو کە مەزامییرەکان بە کەمترین ئاوازەوە بڵێ تا زیاتر لە وتارخوێندنەوە نزیك بێتەوە نەك موناجات)[١٤٥]

پایەدار، وەی لەبۆ حاڵی دەستەی ئەوێ کەنیسەی. ئەدی مەگەر بڕیار نییە هونەر جۆرێ لە عیبادەتی خودایی بێ؟ ئایا عیبادەتی یەزدانیش هونەر نییە؟

ئۆرڵ، تۆ خۆتت لە خۆشەویستی بێبەش کردووە. هەروەکو چۆن ئیدی چێژ لە ناخواردن، بۆنکردنی گوڵەکان و گوێبیست بوونی هەواری مەزامیرەکانی داوود نابینی، پاشان نووسیوتە: (ئەمێستێ دەبێ جارێکی دی باس لە ئارەزووبازی چاوانم بکەم... چاوەکان ئەڤینداری شتە جوانەکان، شێوە هەمەڕەنگەکان و جۆربەجۆرە درەوشاوەکانن، وەلێ نابێ ئەمە بەسەر ڕۆحی مندا زاڵ بێ. ئەمە دەستکەوتێکە لەبۆ یەزدان. ئەوە ڕاستییەکە، کە ئەو هەموو شتێکی لەوپەڕی باشی خۆیدا ئەفراندووە، وەلێ بۆ من خودی یەزدان گرنگە نەك ئەو شتانەی ئەفراندوونی). پاشان وەك ئەوە وایە هەناسەیەکی قووڵ لە دڵەوە هەڵبکێشی و دەڵێی (نوورێکی مادی، شیرینیەکی مەترسیدار و فریودەری هەیە و سەرنجڕاکێشی ژیان لەبۆ ئەوانەی کوێرانە عاشقی جیهان دەبن، زیاد دەکا)، ئا بەم ڕستانەش درێژەی پێ دەدەی: (هەر لەبەر ئەوەیشە



کەسانێکی زۆر هەوڵێکی لە ڕاددەبەدەریان داوە تا لە ڕێگەی جۆرەها هونەر و سیفەتەوە، کەوش و جل و بەرگ، پەرداخ و گوڵدانی هەمەجۆر، بەهۆی ڕەسم و باقی هونەرە جۆرا و جۆرەکانی دیکەوە لە وەسواسی چاو بەرنەسەرێ و زیادی بکەن. لێرەش ڕا زۆر لەوە زێدەتر تێدەپەڕن کە پێویستییەکان و عەقڵ دەیانەوێ و نرخی ئایینی هەیە. لەڕاستیدا، بە ڕواڵەت دەبنە پەیڕەوی ئەوەی ئەفراندوویانە و لە ناوەوەش ڕا ئەو کەسە جێدەهێڵن کە دروستکەریانە، بەم جۆرەش توانای تایبەتی ئەفرێنراوی خۆیان لەناو دەبەن.)[١٤٦]

پایە بەرز، ئادەی بزانم ئایا ئەمە ڕێك و ڕاست توانای ئێمەی ئەفرێنراو نییە کە چێژ لە ئەفرێنراوی یەزدان وەربگرین؟ دەمەوێ جارێکی دی بە بیرت بهێنمەوە هەرگیز درەنگ نییە تا ئودیپ پاشا بکەیتە سەر مەشقی خۆت.[١٤٧]

وا دێتە پێش چاو سەروبنی مەسەلەکە بە هوشیارکردنەوەیەك لەدژی وەسواسێ کە لەدڵەڕاوکێی مرۆڤانەوە هاتووە، دەهێنییەوە یەك: {(دڵەڕاوکێ) نایەوێ بەهۆی جەستەوە لەچێژ تێبگات، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە بە یارمەتی پەیکەری مادیی و لەڕێگای هەمان ئەو هەستە جەستەییانەوە، فێری ئەزموون ببێ. هەر لەبەر ئەوەشە کە ناوی وەك تێگەیشتن و زانین لە خۆی دەنێ. ئەم ویستە هاندەر و (خرۆشێنەری) زانستە...}[١٤٨]. ئۆرڵ، ئەمە خودی ڕستەکانی تۆیە، تۆیەك کە سەردەمانێ هەڵبژێردراو بوویت بۆ کاری گوتاربێژی پاشایەتی لە میلانۆ. بەلای کەمەوە ئەگەر مۆری بێدەنگیت لە لێوەکانت دەدا، وێدەچوو بتوانی خۆت وەکو فەیلەسووف بناسێنی.[١٤٩]

وای [illegible] وریامان دەکەیەوە نەکا زەیین پەلکێشی کشان و گەشتی هەستێران – یان پەلکێشی ئەو تاژییەی بەدوای کەروێشکێکی هەرداندا هەڵدێ. لەگەڵ ئەو بابەتەشدا بەجۆرێکی هێند کورتیلە مامەڵە دەکەی وەك ئەوەی دەتەوێ ڕوونی بکەیتەوە، کە وەسواسی لادان و خزین بەدەست ئەوەی چاو دەیبینێ، کارێکی سروشتییە. نووسیوتە: (زۆربەی کات کە لەماڵێ دانیشتووم بە تامەزرۆییەوە تەماشای مارمێلکەیەك دەکەم کە خەریکی ڕاوکردنی مەگەسێکە، یان تەماشای جالجالۆکەیەك کە لەپاش گرتنی خشۆکان بەدەوریاندا تەونێ دەتەنێ. ڕاستە ئەوانە بووێکی کەم بایەخن، وەلێ ئایا بەرهەمی کارەکە هەمان شت نییە؟ لەڕێی ئەم نیشانانەوەیە کەمن دە بەرابەری تۆدا دەکەومە سەر چۆك، چۆن هەموو شتێکت بەجۆرێکی پایەبەرزانە ئەفراندووە و ڕێکت خستووە. بەڵام لە سەرەتێڕا ئەم خاڵە ڕوانگەی ئەمنی بەخۆیەوە گیر نەدا. لەپڕ بینگرتن شتێکە و بەرنەبوونەوە شتێکی دی)[150]

ئەمن بەتایبەتی بیر دە ئیکارۆسی[151] دەکەمەوە. ئەویش لە هەوەڵێڕا بەخێرایی بینی گرت و لەسەر سەربیش بەربۆوە. هۆکارەکەی ئەوە بوو لەبیری چووبۆوە ئەو مرۆیە. ئەگەر وێکچوونێکی لەوە باشترت گەرەکە دەتوانم ئەو بەڵایەت بە نموونە بۆ بهێنمەوە کە بەسەر خەڵکی بابل هات، ئەو دەمەی بورجێکیان دروستکرد کە تا لەکەشکەڵانی ئاسمانێ هەڵچوو بوو. پایەبەرز، ئەمنیش بە هەمان ڕاستگۆییەوە دەنووسم کە تۆ دەنووسی و نامەکەش لەشەرمان سوور هەڵناگەرێ[152] بەبڕوای من تۆ زۆر ماندوو بوویت بەدەست ئەو ڕووداوانەی لێت قەومان، بەڕاستیی تەپیویت و بۆخۆشت ئەوەی ناشێرییەوە. خۆزیا دەو زەمانەیدا دەتتوانی چەند کاژێرێ لە تەمەنی خاکیانەی خۆت بە من و هەروەها بە دنیای مادیی، بەخشیبا. ئۆرڵ، لەماڵ هەرۆ



دەرێ، هەرۆ دەرێ و لە ژێر دارهەنجیرێکدا ڕاکشێ. هەستەکانت ئازاد کە، با بۆ دواجاریش بێ. ئۆرڵ لەبەر خاتری من و لەبەر خاتری هەموو ئەو شتانەی ڕۆژگارێ بە یەکترمان دابوون. هەناسەیەکی قووڵ هەڵکێشە، گرێ ڕادێرە بۆ دەنگی پەڕەندان و بنۆڕە ئەم گومبەدی مینایە(۱۵۳) و بۆندانی ڕۆحی خۆت پڕکە دە بۆن و بەرامەی سروشت. ئۆرڵ، ئەمەیە ئەو شتەی پێی دەڵێن جیهان و بوونی هەیە، ئەمێستا و لێرەکانە. تۆ هەزارەڕێی پیاوچاکە مەسیحیی و ئەفلاتوونییەکانت تەی کردووە، وەلێ ئیدی بەسە، ئیدی سەر لەنوێ گەڕاویتەوە نێو دونیایی، بۆ شوێنی مرۆییەکان.

*دنیا چەندە فەرەحە و ئێمەش چەندە لە بەرابەریدا نەزانین و ژیانیش، وای.. چەند کورتە*. لەبیرت دێ، وەختێ ئەتۆش سیسەرۆت دەخوێندەوە، بەخۆشت دەتتوانی ئەم شتانە بلێیی.

وێدەچێ خوداوەند مەبەستی نەبێ مامەڵە بەرۆحی ئێمەوە بکات، ڕەنگە و وا پێدەچێ ئەو خودایەکی میهرەبان و پڕ بەزەیی بێ، خواوەندێ کە ئێمەی ئەفراندووە تا دەو جیهانەیدا بژین.

وای، ئۆرڵ، خۆزگا دەنێو سروشت و دەژێر دار هەنجیرێکدا پشووت دەدا- وای دەهێنمە پێش چاوی خۆم کە هەنجیرێکت بە دەستانەوە گرتووە و لەو حاڵەتەشدا بێ دوودڵی دەهاتم و نێوچاوانە گرژەکەتم ماچ دەکرد. دەبێ زۆر هەوڵ دەم کە بتوانم ئەو وشە ترسێنەر و گەنیوەی (خۆپارێزی)م پێ قووت بچێ، چونکی ئەمێستاکەش، بەڵێ ئەمێستاکەش ئەم وشەیە وەکو بارێکی قورس دەمێشکی تۆدا ماوە. تەنێ شتێ کە دەیتوانی تۆی لێ ڕزگار بکا، باوەشەکەی من بوو. ئاخر بۆ دەبێ قەرتاجنە ئەوەندە لە هیپۆرگیۆسەوە دووربێ؟

وڵ[illegible]ەم هەرچۆنێ بێت ئەم نامەیەت بەدەست بگا، کەواتە ئاواتم وایە وەی خوێنی، [illegible]ێ بەڕاستی ئیدی هەست ناکەم قسەی من کار لەتۆ بکا، بەناچاریش گۆزەی ڕۆنەکەم شکاند و ماندوو بوونم بەفیڕۆ چوو[١٥٤]

ئۆرڵ، ترسێکی زۆر دایگرتووم. ترسم هەیە لەوەی ڕۆژگارێ پیاوانی کەنیسە بەسەر ئافرەتانێکی وەك منی دەهێنن، نە بەوهۆیەوە کە ئافرەتین، چۆن خودا بۆ خۆی ئێمەی وەك ژن ئەفراندووە. بەڵکو بەو هۆیەوە کە وەسواسی ئێوەی پیاو دەکەین هەر بەوجۆرەی کە خوداش ئێوەی وەك پیاو ئەفراندووە، ئایا لەو بڕوایەدایت یەزدانی مەزن فەزڵی خواجە و خەسیوەکان بدا بەسەر ئەو پیاوانەدا کە دڵیان دە گرۆی ئافرەتێك ناوە؟ لەو دەمەیدا هۆشت پێوەبێ چۆن ستایشی دەستنەخشی خودای دەکەی، چونکە خودا بۆ وەی پیاوی نەئەفراند تا خۆی بخەسێنێ.

قەتاوقەت ئامادەنیم ئەوەی لە ڕۆما قەوما لەبیری خۆمی وەبەم و ئیدی بیریش لە خۆم ناکەمەوە. چونکێ ئەوێ ڕۆژێ من نەبووم کە تۆ بە قامچی ڕقی خۆتت بەسەردا باراندم. پایەدار، ئەو ژنە (دایکە) حەوابوو، نموونەی گشت ئافرەتان، ئەو کەسەش زوڵمێ لە نەفەرێ بکا، هەڕەشەیە بەسەر هەمووانەوە.[١٥٥]

لەترسی ڕوو بەڕوو بونەوە دەلەرزم، چونکێ خەوفی ئەوەم هەیە ئەو ڕۆژەبێ کە ئافرەتێکی وەك من بەدەستی پیاوانی کەنیسەی جیهانی لەنێو بچن. پایەبەرز، دەشزانی بۆچی لەنێویان دەبەن؟ لەبەر ئەوەی پێتدەڵێن کە تۆ ڕۆح و تواناکانی خۆتت ڕەت کردوونەتەوە. ئەمەش لە پێناوی چیدا؟ لە پێناوی خودایەکدا، کە بەقسەی هەمووتان، لەپشت سەرتانەوە ئاسمانێکی ئەفراند و لەژێر پێشتاندا زەوی دروستکرد کە لەڕاستیدا (پڕە) لەو ئافرەتانەی ئێوە دەهێننە سەر دنیا.



***ئەگەرەکو خودایەك هەیە، لێگەڕێ با چاو دە گوناهەکانی تۆ بپۆشێ. بەشکم ڕۆژێکیش بەو هۆیەوە کە جەنابت پشتت لە هەموو چێژەکانی ژیان کرد، دادگاییت بکا. تۆ ئەڤین ڕەت دەکەیەوە، ڕەنگە ئەمە قەبووڵ بکرێ، وەلێ (بۆچی) بەناوی خوداوە ئەڤین ڕەتبکرێتەوە؟***

*چ کورتە ژیان و ئێمەش چەنێ کەم لەبارەیەوە دەزانین.* وەلێ ئەگەر تۆ فەرمانت دابا *دانپیانانەکانت* بدرێتە من تاکو لێرە، لە قەرتاجنە موتالاّیان بکەم، وەلاّمەکەم بە نەء دەبوو. پایەبەرز، ئەمن ڕێگە نادەم تەعمیدم بکەن، *ئەوی لێی دەترسم خودا نییە، وا هەست دەکەم ئەمێستەکانێ لەگەڵ خودای خۆمدا دەژیم و ئایا هەرچییەکیش بێ، ئەمن دروستکراوی وی نیم؟ عیسای مەسیحیش نییە کە ڕێدەگرێ ئەو کارەی بکەم، چونکە ئەو بەڕاستی پیاوی یەزدان بوو. ئایا پشتیوانی ئافرەتە میهرەبانەکان نەبوو، ئەو؟ ترسی من لە پیاوچاك و یەزداناسە مەسیحییەکانە.* لێگەڕێ خودای عیسای مەسیحایی لە بۆ هەموو ئەو ئەڤین و خۆشەویستییەی ڕەتکردۆتەوە، لێت خۆشبێ.

قسەی خۆمم کردن و ئازادم کرد ڕۆحم[١٥٦] و ئەمێستاکەش ئەی پایەدار، کاتی وەیە جامێ فرکەین[١٥٧]. من دەژێر دار هەنجیرەکەمدا، لە قەرتاجنە، دانیشتووم. ئەمساڵ ئەوە بۆ سێیەمین جارە خونچەی دەرهاویشتوون[١٥٨] وەلێ دریّغا بۆ بەرهەمێ[١٥٩] بەدوعا[١٦٠].

* * *

# دوا وته

من ڕوو بەڕووی زۆر پرسیاران بوومەتەوە. ئایا فلۆریا نامەکەی نارد بۆ ئۆرلێ؟ کێ نالێ لە دوا ساتەوەختدا بوێری ئەوەی نەبوو بینێرێ؟ لە نامەکەدا ئاماژەیەك لەم بارەیەوە هەیە. دەنووسێ ترسی هەیە لەو بەڵایەی ڕۆژگارێ پیاوانی کەنیسە بەسەر ئافرەتانێکی وەك ئەوی دەهێنن.

هەر وەکو لە هەندێ لە پەراوێزەکانەوە دیارە، من کەم تا زۆر دڵنیام نامەکە بۆ ئەسقەفی هیپۆرگیۆس نێردرا. بۆی هەیە ئەم نامەیە بەدرێژایی مێژووی کەنیسەی کاتۆلیکی شاردرابێتەوە. تەنانەت ئەگەر نوسخەگەلێکی زۆریشی لەبەر هەڵگیرابێتەوە و دەست بە دەستیش کرابێ، بەمانای ئەوە نییە کەسانێکی زۆر بینیبێتیان. وێڕای ئەمەش نوسخەی سەرەکیی نامەکە هەتا سەدەی شازدەیەم، ئیدی بە ئەنقەست بووبێ یان بەڕێکەوت، کە لە پڕێك ئاشکرابوو، هەر بە شێردراوەیی هەڵگیرابوو. بەڵام لەوە دوا چی ڕوویداوە؟

ڕەنگە ئەم نووسخەیەی لای من لە (نامەکەی فلۆریا) لە کتێبخانەی دەیرێکدا شاردرابێتەوە تاوەکو لەم دواییەدا دۆزرابێتەوە و پاشانیش فرۆشرابێ بەو کۆنە کتێبفرۆشەی بازاڕی بۆنیۆس ئایرۆس. کتێبفرۆشەکە دانی بەوەدا هێنا کە دەیەوێ بە



زەوقی کڕیارەکانی بێ. تەنانەت قەشەیەکیش یان هەر کەسێکی دی بۆی هەیە خۆی لە هەلومەرجی بێ پارەییدا ببینێتەوە.

وەلێ سەبارەت بە گەیشتنی نامەکە من ئەگەرێکی دی دەخەمەڕوو. با وای دابنێین کە ئاگۆستین نامەکەی لە فلۆریا وەرگرتبێ، یان وەرنەگرتبێ. بۆی هەیە عەرەبەکان، وەختێ لە سەدەی حەوتەمدا هێرشیان کردە سەر ئەفریقای باکوور، نامە کۆنەکەیان دۆزیبێتەوە، پاشان وێدەچێ لەگەڵ خۆیان بردبێتیان بۆ ئیسپانیا، ئەو شوێنەی کە بۆ ماوەی سەدان ساڵ نامەکەی لێپارێزرا و پاشانیش لەلایەن هێرشبەرە ئیسپانییەکانەوە گوێزرایەوە بۆ ئەمریکای خواروو.

ئایا نوسخەی ئەسڵی نامە کۆنەکە هێشتا هەر ماوە؟ وەلێ بەلای منەوە، پرسیارێکی دی گرنگترە: ئایا پەرچەکرداری ئاگۆستین دوای وەرگرتنی نامەکە لە ئەڤینداره کۆنەکەیەوە، چی بووە؟ چی لە نامەکە کرد؟ و چی لە فلۆریا کرد؟

ئێمە هەرگیز ناتوانین بزانین ئاخۆ ئاگۆستین نامەکەی فلۆریای وەرگرت یان نەء. هەرچەندە لەم دواییانەدا، چەند ساڵێ لەمەو بەر نامەیەکی نەناسراوی ئاگۆستین دۆزرایەوە (پیتەر براون، پەیکەر و کۆمەڵگا، بڵاوکراوەی زانکۆی کۆلۆمبیا، نیۆرك١٩٨٨ـ ٣٩٧).

لەڕاستیدا گەمژەییم کرد کە بەلای کەمەوە داوای ڕەسیدێکم لە کتێبخانەی ڤاتیکان نەکرد.

یۆستین گۆردەر

ئۆسلۆ،٨ی ئاگوستی ١٩٩٦

## پەراوێزەکان

Catechu n audior بەمانای گوێگری سەربەست. فلۆریا وشە لاتینییەکە بەکار دەهێنێ.

٢- مەبەست یەزدانە. ئاگۆستین کتێبی دانپیانانەکانی لەشێوەی دانپیانان لە بەردەمی یەزداندا نووسیوە.

٣- دانپیانانەکان، بەرگی چوارەم، ل ١٥.

٤- فلۆریا ناوی لاتینی Mediolanum بەکاردەهێنێ.

٥- دایکی ئاگۆستین.

٦- دانپیانانەکان، ب ٤، ل ٥.

٧- Otempora , Omores! سیسەرۆ لە گوتارەکانیا چەندین جار ئەم دەربڕینەی بەکارهێناوە. ڕەنگبێ ئاماژەدانی بەردەوامی فلۆریا بە نووسەران و فەیلەسوفە ڕۆمییەکان نیشانەیەك بۆ پەسننیی ئەوەی کە ئیتر ئەو ئافرەتێکی دانایە.

٨- نەمتوانی ئاشکرای بکەم فلۆریا ئاماژە بەکام نووسەری یۆنانی دەکا.

٩- Obitus veris ، بە واتای لەناو چوونی ئەڤینە.

١٠- دانپیانانەکان، ب هەشتەم، ل١١.

١١- Multa paucis

١٢- Dum vitant stulti vitia in contraria currunt

١٣- سیسەرۆ (لە١٠٦تا ٤٣پ.ز) سیاسەتوان، گوتاربێژ و فەیلەسووف کە ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لە بلاوبوونەوەی فەلسەفەی یۆنانی لە ڕۆمدا. وەك فەیلەسووفێ، دەستنیشانکراوترین تایبەتمەندی ئەو ئەوەیە کە دەکرێ بە (مونتاژکەر)ی ناو ببەین. واتە کەسێ کە هەوڵ دەدا باشترینی سیستەمە فەلسەفییەکان وەربگرێ، لەگەڵ یەکتر تێکەڵیان بکا و لەوانە فەلسەفەیەکی تایبەتییان لێ پێکبهێنێ. ئەو کتێبەی کە ئاگۆستین لە دانپیانانەکانیدا ئاماژەی بۆ دەکا (Hortensius)ە کە ئەمێستاکە دەقەکەی ونبووە.

١٤- دانپیانانەکان، ب سێیەم، ل ٤.



١٥- فلۆریا گەمە بەو زاراوەیە دەکات کەلە هەموو نامەکانی یۆنالیۆس (Juvenal)ەوە وەرگیراوە (Vitamimpenoere vero)

١٦- یاریکردنێکە بە گوتراوێك کە بەپێی گێڕانەوە کۆنەکان لە ئەرستۆوە بە ئێمە گەیشتووە: (Amicus plato sed magis amica veritas) (ئەفلاتۆن لەلای من ئازیزە، بەڵام ڕاستی ئەزیز ترە)

١٧- بە بڕوای من لێرەدا فلۆریا ئاماژە بە بەرهەمی نووسەرانی تر دەکات.

١٨- Feminis Lugere honestum est, viris memini sse

١٩- دانپیانانەکان، ب٩، ل ٦.

٢٠- بەمانای یەزدان.

٢١- گەرچی سینیکا دەڵێ پێویستە گوێ بۆ قسەی لایەنی تریش بگرین، لە نامەکەی فلۆریادا ئەم دەربڕینە بە شێوەیەکی جیاواز هاتووە. لێرەدا ئەم پرنسیپە دیالیکتیکییە بەجۆرێ کورتکراوەتەوە وەك ئەوەی دەقاودەق قسەکانی ئاگۆستین لە مەتنی کتێبی ( De duabus animabus)ساڵی (٣٩١) گوێزرابنەوە (audiatur et altera pars) ڕێی تێ دەچێ فلۆریا ئەم بەرهەمەی ناسیبێ. ئەمن بەخۆم وای بەباش دەزانم بیر لەو ئەگەرە بکەمەوە کە ئەوە خودی ئاگۆستینە بیروڕاکانی لە ڕوانگەی فلۆریاوە (Forum Romanum) لە زستانی ساڵی (٣٨٨) بەیاندەکا.

٢٢- دانپیانانەکان، ب. یەکەم، ل٢ تەماشای کتێبی پیرۆز، نامەی پۆلس بۆ ڕۆمییەکان، بەشی دووەم، ئایەتی ٣٦ بکە.

٢٣- دانپیانانەکان، ب یەکەم، ل٧.

٢٤- دانپیانانەکان، ب یەکەم، ل١١.

٢٥- مانەویەت بزاڤێکی ئایینی بوو کە لە سەردەمی ئاگۆستیندا برەوی سەندبوو. نیوەی بنەماکانی (ئەم بزاڤە) ئایینی و نیوەکەی تریشی فەلسەفی بوون و تیایدا مەسەلەی ڕزگاری لەچوارچێوەی تێوری دوالیزمدا بینا کرابوو، بەپێی ئەم تێورییە جیهان بەسەر چاکە و خراپە، ڕووناکی و تاریکی، ڕۆح و ماددا دابەش دەبێ. بەم پێیەش مرۆڤ توانای هەیە بە یاریدەی ڕۆح لە دونیای مادی بچێتە دەرێ و بەو جۆرەش بنەمای ڕزگاری ڕۆح دابڕێژرێ.

- یانانەکان، ب یەکەم، ل٣٢.
- Plaudite بە مانای پیرۆزبایی.
- دانپیانانەکان، ب دەیەم، ل٣١.

٢٩- Dulce est desipere in loco

٣٠- Nihil tam absurdum dici potest ut non dicatur a philosopho

٣١- دانپیانانەکان، ب، دووەم، ل١.

٣٢- دانانەکان، ب، دووەم، ل٢.

٣٣- سوودوەرگرتنێکی ئازادانەیە لە گوتەیەکی بەناوبانگی تیرنس: Homo sumf nihil humanum a me alienum puto (من مرۆڤم و هیچ شتێکی مرۆڤانە بۆ من نامۆ نییە).

٣٤- دانپیانانەکان، ب، دووەم، ل٦.

٣٥- دانپیانانەکان، ب، دووەم، ل٢.

٣٦- تورەیی فلۆریا سەبارەت بە بەکارهێنانی ئەم ئایەتە لەلایەن ئاگۆستینەوە و دەرەوەی سیاقی خۆی، جێی تێگەیشتنە. تەماشای نامەی یەکەمی پۆلس بۆ قەرەنتییەکان، بەشی حەوتەم، ئایەتی ١-٧ بکە: (سەبارەت بەوەی بۆ منتان نووسیوە، باشترە بۆ پیاو ژن نەهێنێ. بەڵام، تا دوور بکەونەوە لە تاقیکردنەوەی داوێن پیسی، با هەر پیاوێك ژنی خۆی هەبێ، هەروەها هەر ژنێکیش مێردی خۆی هەبێ. با مێرد چ مافێکی ژن و مێردایەتی بەسەرەوەیە سەبارەت بە ژنەکەی بیداتێ، هەروەها ژنیش هی مێردەکەی. چونکە ژن دەسەڵاتی بەسەر لەشی خۆی نییە بەڵکو هی مێردەکەیەتی. هەروەها مێردیش دەسەڵاتی بەسەر لەشی خۆی نییە، بەڵکو هی ژنەکەیەتی. کەستان خۆی بێبەش نەکات لەوەی دیکە، تەنها کاتێك نەبێ کە هەردووکتان لەسەر ئەوە ڕێك کەوتبن، بە مەبەستی کات تەرخان کردن بۆ نوێژ، ئینجا بگەڕێنەوە بۆ ژیانی ژن و مێردایەتی جاران، تاکو بەهۆی خۆ ڕانەگرتنتانەوە نەکەونە تاقیکردنەوەی شەیتان، ئێستا ئەوەی من لێرە پێتان دەڵێم، وەك ڕێگا دانانە نەك فەرمان پێکردن.



ئەم دەقەم ڕاستەوخۆ لە وەرگێڕانە کوردییەکەی ئینجیلی پیرۆزەوە وەرگرتووە. بڕوانە ئینجیلی پیرۆز کۆمەڵەی دەولی کتێبی پیرۆز، چ یەکەم، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین هەولێر ١٩٩٨، ل ٣٠٧-٣٠٨.

٣٧- Naturam expellas furca tamen usque recurret

٣٨- دانپیانانەکان، ب، دووەم، ل٢. کتێبی پیرۆز، ئینجیللی مەتتا، بەشی ١٩، ئایەتی ٢١. ئەم ئایەتەی مەتتا ژمارەیەك لە بڕوادارە مەسیحییەکانی هاندا تا خۆیان بخەسێنن، لەوانەش ئۆریگنیس (origenes)، لە ساڵی ١٨٥ تا ٢٤٥) کە لە باوەکانی کەنیسە بوو. لە وەرگێڕانە لاتینییەکەی ئەو ئینجیلەدا کە لەبەر دەستی ئاگۆستیندا بوو، ئایەتەکە بەم جۆرە تەرجەمە کراوە: Sunt enim eunuchi qui de matris utero sic nati et sunt eunuchi qui facti sun tab hominibus; etsunt eunuchi qui se ipsos castraverunt propter regrum caelorum;qui potest caperecapiat.
(جا بەشێك خەساو هەن کە بە خەساوێتی لەدایك دەبن، بەشێکی دیکەشیان خەڵکی خەساندویانن، هەروەها خەساویش هەن خۆیان خەساندووە لەپێناوی پادشاهێتی ئاسمان. (کەواتە) کێ دەتوانێت بەمە ڕازی بێت، با ڕازی بێت). بڕوانە ئینجیلی پیرۆز بە زمانی کوردی، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٦.

٣٩- دانپیانانەکان، ب. دەیەم، ل٣٠.

٤٠- لە تراژیدیاکەی سۆفۆکلیسەوە بەناوی (ئۆدیب پاشا). لە ئەنجامدا کاتێ ئۆدیب تێگەیشت کە لایۆسی باوکی خۆی کوشتووە و لەگەڵ جۆکاستای دایکیدا زەماوەندی کردووە، بە دەرزی سەعاتە ئارایشییەکەی دایکی هەردوو گلێنەی خۆی دەرهێنا.

٤١- دانپیانانەکان، ب. سێیەم، ل١.

٤٢- لە کتێبی (ئەنەئید)ی ڤێرژیلەوە. ئاینیاس لەپاش ئەوەی لە قەرتاجنە کەشتییەکەی خاکگیر دەبێ، دەکەوێتە دروستکردنی پەیوەندییەکی ئەڤیندارانە لەگەڵ دیدۆ، مەلیکەی ئەوێ، بەڵام چارەنووس شتێکی فرە جیاوازتری لە نێوچەوان دەنووسێ. ئاینیاس خۆی لە داوی ئەڤینی دیدۆ ڕزگار دەکا، بەرەو ئیتاڵیا و (پاشانیش ڕۆما) دەڕوات و پاشانیش لەوێ فەرمانڕەواییەکی بەهێز دادەمەزرێنێ. ئەو بەبێ نیشاندانی تۆسقاڵێ بەزەیی لە ئاست دیدۆ

چارەنووسە خەماوییەکەی وادەکا، دڵی شکاوی دیدۆ و ئەو خەمەی لە ئەڤینە ناکامەکەیەوە پەیدا دەبێ، دەبێتە هۆی خۆکوشتنی.

- فایدۆن (phaedo) یەکێ لە گفتوگۆکانی ئەفلاتوونە کە تیایدا سوکرات باس لە نەمری و مانەوەی ڕۆح و گیان دەکات.

٤٤- فۆرفوریوس porohyrius (٢٣٢ تا ٣٠٤) فەیلەسووفێکی ئەفلاتوونیی نوێ و قوتابی فلۆتینە.

٤٥- بە گوتەی هۆراس: Quot capita, tot sensus

٤٦- ئامبروسیۆس Ambrosuis (٣٣٩-٣٩٧) بەرلەوەی پێگەی ئەسقەفی لە میلانۆ بدرێتێ، کاری بەرزی دەوڵەتی لە ئەستۆ بوو.

٤٧- دانپیانانەکان، ب سێیەم، ل١.

٤٨- Prim esse, tum philosophari

٤٩- دانپیانانەکان ب. چوارەم، ل٨.

٥٠- Scortum بەمانای پێست دێت، بەڵام لە هەمان کاتیشدا مانای لەشفرۆشیش دەگەیەنێ.

٥١- Delictum

٥٢- Peccatum

٥٣- لێرەدا فلۆریا تێبینییەك لەسەر ڕەسمی کۆنی هاوسەرداری لە ڕۆما دەردەبڕێ.

٥٤- دانپیانانەکان، ب سێیەم، ل١٢.

٥٥- مەبەست ئاگۆستینە.

٥٦- دانپیانانەکان، ب سێیەم، ل٢.

٥٧- تەماشای پەراوێزی ژمارە (٥٣) بکە . ئەم قسەیەی ئاگۆستین کە گوتبووی: (لە هەر جێیەك تۆ هەبووی منیش هەبووم) بۆ زۆر لە هاوسەردەمەکانی خۆی بە مانای پەیوەندی ژن و پیاو بوو لە تێکەڵی هاوسەرداریدا.

٥٨- دانپیانانەکان، ب. نۆیەم، ل١٢.

٥٩- تەماشای پەراوێزی ژمارە (٤٠)بکە. ئۆدێب، بێ ئاگا لە کارەکەی خۆی لەگەڵ دایکیدا هاوسەرگیری دەکات و چوار منداڵی لێی دەبێ.



٦٠- Furor poeticus بە مانای جنونی شاعیرانە.

٦١- Ridendo dicere verum لە هەجوونامەکانی هۆراسەوە وەرگیراوە.

٦٢- Vita brevis بە لاتینی واتە: ژیان کورتە.

٦٣- ئەم گوتەیە بە مجۆرە لە دانپیانانەکاندا، ب. چوارەم، ل٢ بەردەوامی هەیە: (لە تێکەڵیمدا لەگەڵ ئەو توانیم جیاوازی نێوان هاوسەرگیری بە مەبەستی وەچەخستنەوە ئەزموون بکەم و جیاوازیی ئەوەش لەگەڵ پەیوەندی ئەڤیندارانە کە تەنێ بەنیازی دەوڵەمەندکردنی مەیلە نەفسانییەکان هاتۆتە ئاراوە، تێبگەم، کە بێگومان ئەو وەچانەی لەو ڕێگەوە دەخرێتەوە، نەویستراون، هەرچەندە مرۆ پابەندە بەوەی مادام لە دایکبوون خۆشی بوێن). لە ڕواڵەتدا فلۆریا بە جۆرێ لە ئاست ئەم بەشەی دانپیانانەکاندا هەستی بە بێموبالایی کردووە، تەنانەت زەحمەتی ئەوەیشی بە خۆی نەداوە ئاماژەی پێبکات، ئەو بە پێچەوانەوە جەخت لەسەر ئەو ئەزموونە دەکاتەوە و پێوانەیە ئەوان وەك ژن و مێرد پێکەوە ژیاون.

٦٤- Claudius ئاگۆستین ناوی ئەم یارە نالێت.

٦٥- دانپیانانەکان، ب. چوارەم، ل٦

٦٦- دانپیانانەکان، ب. چوارەم، ل٧

٦٧- دانپیانانەکان، ب. چوارەم، ل٨

٦٨- دانپیانانەکان، ب. پێنجەم، ل٩.

٦٩- دانپیانانەکان، ب. پێنجەم، ل٩.

٧٠- لێرەدا نابێت نەفرەتی ئەبەدییانەی ڕۆح لەگەڵ داوەریکردنی یەزدانیانەدا تێکەڵ بکەین. لە تەواوی دنیای کۆندا تیۆرەییەك لە نێو بزاڤە فەلسەفییە باوەکاندا هەبوو کە دەیگوت هەندێ لە ڕۆحەکان دووچاری نەفرەتی ئەبەدی دەبن، لە کاتێکدا هەندێکی تریان ئامادەیی ژیانێکی ئەبەدی بە دەستدەهێنن.

٧١-ڕەواقییەکان بزاڤێکی فەلسەفی بوون کە جەختیان دەکردەوە سەر هاوسەنگی مەعنەوی و گونجانی لەگەڵ هۆشی ڕێکخەری دنیادا. ئەوان لەو بڕوایەدا بوون گشت پرۆسە سروشتییەکان- بۆ نموونە نەخۆشی و مردن- پێڕەوکەی یاسا نەشکێنراوەکانی

ڕێشت دەکەن. لێرەوە دەبێ مرۆڤ فێر ببێ خۆی بداتە دەست چارەنووسی خۆی.

٧٢-واتە گومانکاران. خودی ئاگۆستین ئا بەم وشانە شییاندەکاتەوە: (ئەوان لەو بڕوایەدان کە دەبێ سەبارەت بە هەموو شتێ گومان بکەین و ڕایانگەیاند مرۆڤ توانای تێگەیشتنی لە هیچ جۆرە ڕاستییەك نییە).

٧٣-فلۆرەنسا.

٧٤-لەوانەیە گواستنەوەی مانای ئەم پەندە بەناوبانگە بێت Ubi mens plurimaibi، minma fortuna (لە هەر شوێنێ ئاوەز زێتر بێ، سەرسمدان کەمترە).

٧٥-بەردێکی گرانبەها، سەدەفێ یان شتێکی لەو جۆرە کە لە سەریان هەڵدەکۆڵێ. ئەمەش هونەرێ بووە لەو سەردەمەیدا زۆر باو بووە.

٧٦-Nil nisi bene لێرەدا فلۆریا یاری بەم پەندە دەکا De mortuis nil nisi bene (هەڵم لە مردووەوە هەڵناستێ) ئەگەر وابێ ئەوە دەکرێ مانای ڕستەکە بەکینایە وەربگێڕدرێ و مانای ئەوە بدا کە چیدی ڕۆحی ئۆرِێ زیندوو نییە.

٧٧-In florentia floria floruit

٧٨-Auro،(وەك ئاڵتوون) مانای بەشێ لە گەمە کردنەکان بە وشە و لە وەرگێڕاندا لە ناوچووە.

٧٩-دانپیانانەکان، ب شەشەم، ل٣

٨٠-دانپیانانەکان، ب پێنجەم، ل١٤

٨١-دانپیانانەکان، ب شەشەم، ل١١. تەماشای پەراوێزی ٧٢ بکە.

٨٢-دانپیانانەکان، ب. شەشەم، ل١١.

٨٣-هەمان سەرچاوە



٨٤-Nomina sunt odiosa بە مانای ناوەکان ستایشکراون، ڕەنگە لە گوتاری سیسەرۆوە لە بەردەمم ڕۆسکیۆس (Roscius) وەرگیرابێت.

٨٥-هاورێ و پاشانیش قوتابی ئاگۆستین، خەڵکی هەمان شاری تاگاستەیە، کە ئاگۆستینیشی لێ لە دایك بووە. ئالیپیۆس، لە پێش ئاگۆستیندا چوو بۆ ڕۆما تا زانستی ماف بخوێنێ. ئەو جووتە لە پاشاندا پێکەوە چوونە میلانۆ (دانپیانانەکان، ب شەشەم، ل٧-١٠)

٨٦-دانپیانانەکان، ب. شەشەم، ل١٢

٨٧-ئەگەری ئەوە هەیە ئاگۆستین لە دوای جوێبونەوەی لە هاوژینەکەی ئازارێکی ڕۆحی زۆری تووشهاتبێ، هەرچەندە لە دانپیانانەکاندا باسی ئەمە ناکات، لە وێدا تەنانەت بچووکترین ئاماژەش بەو برینانەی لە فلۆریای کردن ناکات. وەلێ لە دەقی کتێبەکەیدا (De bono coniugali) (سەبارەت بە سوودەکانی هاوسەرگیری ٤٠١) کەوا پێدەچێ ماوەیەك پاش ئەوەی نامەکەی فلۆریای بەدەست گەیشتووە، نووسیوێتی، دان بەوەدا دەهێنێ کە ئەو پیاوەی مەعشووقە وەفادارەکەی بە مەبەستی هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێکدا، جێدەهێڵێ، تاوانبارێکی خیانەتکارە. ئەم تیورەیە لەلایەن هەموو مەسیحییەکانەوە پەسەند نەکرا. هەتاکو ناوەڕاستەکانی سەدەکانی ناوەنجی ئەوەی کە پیاوێ لە پێش هاوسەرگیریدا هاوسەرینێکی هەبێ، شتێکی قەبوولکراو بوو. بۆ نموونە، ئەسقەف لیۆنی ڕۆمی، کە لە ناوەڕاستی سەدەی پێنجەمدا دەژیا، گوتوویەتی: پیاوی مەسیحی دەتوانێ لە پێش ژنهێنانیدا هاوسەرینەکەی جێ بهێڵێ. لەو دەمەدا ئەم گوتەیەیان بە مانای جیابوونەوە (تەڵاقدان) یا چەند هاوسەری لێك نەدەدایەوە، بە پێچەوانەوە بە جۆرێ لە

ڕەو پێشبردنی ئەخلاقییان لە قەڵەم دەدا. بەڵام ئاگۆستین ئەم تیۆرەی ڕەت کردبووە، بە بڕوای ئەو پیاوێ کە لەگەڵ ئافرەتێ دەچووە جێگاوە، نەدەبوو دەستی لێ هەڵگرێ و لەگەڵ ژنێکی دیکەدا پەیمانی هاوسەرێتی ببەستێ.

بە بڕوای من جێی سەرنجدانە بپرسین ئەگەر ئاگۆستین نامەکەی فلۆریای پێنەگەیشتبوو، ئەویش ڕێك بە دوای نووسینی دانپیانانەکاندا، ئایا دەهاتە سەر ئەو بڕوایەی بەرگریی لە پێگەی (هاوسەرداری) یان مافی هاوژینان، بکات. لەم ڕووەوە پێدەچێ دواجار فلۆریا لەسەر هەقبێ کە گوتوویەتی لە ڕاستیدا نامەکەی ئەو بۆ ئۆرل، نامەیەکە بۆ هەموو کەنیسەی مەسیحایی.

هەتا ئەم دواییانە، لەساڵی ١٩٣٠دا پاپا لە دەقی کتێبەکەی ئاگۆستینەوە بە نێوی (سەبارەت بە سوودەکانی هاوسەرکاری) گوتەی هێناوەتەوە، بەبێ ئەوەی کە ئاگای لەوە بێ ئەو کتێبە بە جۆرێ لە ژێر کاریگەری نامەکەی فلۆریادا نووسراوە ئەگەر چی من بۆ خۆم لەو بڕوایەدام هەم ئەو و هەر پاپاکانی پێش ئەویش ئاگایان لە دەقی (کودکس فلۆریا) هەبووە.

٨٨- دانپیانانەکان، ب شەشەم، ل١٣.

٨٩- Peccatum هەڵە، کەمتەرخەمی، بنۆڕە وشەی یۆنانی himatia کە هاوتایە بە هەڵەیەك کە دواجار دەبێتە هۆی تێکشکانی پاڵەوانی تراژیدی.

٩٠- یۆنانییەکان وشەی himation بەکار دەهێنن، نەك toga، کە ناوی لاتینی جلوبەرگی نەتەوەیی ڕۆمەکان بوو. لەگەڵ ئەوەشدا فلۆریا سوود لە وشەی تۆگا وەردەگرێ.

٩١- Sic Aureli! Sic



٩٢- دەبێ ئەمە ئاماژەدانێکی شاراوەبێ بە قسەی سیسەرۆ omnia mea macum porto کە ئەویش دەیدایە پاڵ فەیلەسوفی یۆنانی بیاس (Bias)، کە ناچار بوو بە دەستی بەتاڵەوە لەبەر دوژمنەکانی ڕا بکا. بەڵام لە ڕاستیدا ئەو بەنرخترین شتی لەگەڵ خۆی برد کە ئەویش ئەزموون و ئارەزووی خۆی بوون.

٩٣- ئاماژە دانێکە بە تراژیدیای (میدئا)ی یۆریپیدس (Eurpides)، لەم تراژیدیایەدا بەو هۆیەوە کە مێردەکەی میدئا بە نێوی یاسۆن (Jason) ئەوی فریودا، میدئاش هەستا هەموو منداڵەکانی کوشت. بەم پێیەش وا دەردەکەوێ نەفرەتی میدئا لە مێردەکەی زۆرترە لە خۆشەویستی بۆ ئەو منداڵانەی لەوی هەبوون، لە پێگەی بەراوردکردندا ئەڤینی پایەڕووخێنی میدئا و دیدۆ هیچ لێکچونێکیان لە نێواندا نییە.

٩٤- دانپیانانەکان، ب. شەشەم، ل١٣ تەمەنی باو بۆ هاوسەرگیری لە نێوان ١٢-١٣ساڵی بوو. لەم ڕووەوە دەتوانین مەزەندە بکەین کە کیژە ١١ ساڵ زیاتر نەبووە هەر وەك ئەوەی فلۆریا لەوپێش نووسوویە.

٩٥- دانپیانانەکان، ب شەشەم، ل١٥.

٩٦- پێشوو.

٩٧- ئەبیکۆر (Epicure) ٣٤١تا٢٧٠ی پ.ز. فەیلەسوفی یۆنانی و نیشتەجێی ئەسینا. ئەبیکۆر بڕوای بە ئەتۆمیزمی دیمۆکریتس (Democritus) هەبوو و لەو بڕوایەشدا بوو فەلسەفەی مادی دەتوانێ ترسی مرۆڤ لە مردن و سزای خواوەندەکان بڕەوێنێتەوە. ئەو گوتوویەتی (مەرگ پەیوەندییەکی بە ئێمەوە نییە و کاتێکیش مەرگ نەبێت، ئیدی ئێمە نین). ئەو فەلسەفە ڕزگارکەرەکەی خۆی لەگەڵ ئەو شتەدا ئاوێتە کردبوو کە پێی دەگوت (چوار دەرمانە

ڕەسەرەکە)، (نابێ لە خودا بترسین، نابێ لە خەمی مەرگدا بین، چاکی بە سانایی دێتە دەست، ئاسانە بەرگەگرتنی کارەسات).

٩٨- دانپیانانەکان، ب شەشەم، ل١٦.

٩٩- نەمتوانی ئەو یۆنانییەی فلۆریا لێرەدا ئاماژەی پێدەکا بدۆزمەوە.

١٠٠- کاتێ تیسۆس (Theseus) نییەتی چوونە ناو ئەو هەزار توونەی کەوتە سەر کە لە دورگەی کرێت بوو، هەروەها مەبەستی بوو ئەو دڕندەیە بکوژێ (مینوتۆر) کە هەموو نۆ ساڵ جارێ داوای حەوت کوڕ و حەوت کچی لە (ئاتینا) دەکرد، ئاریادنە (Ariadne) گلۆڵە بەنێکی دایە. بە یارمەتی گلۆڵە بەنەکە تیسیۆس توانی خۆی لە ونبون لە نێو هەزار توونەکەدا ڕزگار بکا.

١٠١- تەماشای پەراوێزی پێشوو بکە.

١٠٢- Picator hominum وەرگێڕانی لاتینی ئینجیل کە بە گریمانەی زۆر فلۆریا سوودی لێوەرگرتووە. ئینجیلی مەرقوس، بەشی یەکەم، ئایەتی١٧ (عیسا بە ماسیگرەکانی گوت: وەرن دوام بکەون، دەتانکەم بە ڕاوکەری مرۆڤ). تەماشای ئینجیلی مەتتا، بەشی چوارەم، ئایەتی١٩ بکە. (بڕوانە وەرگێڕانی کوردی ئینجیلی پیرۆز ل٦١).

١٠٣- دانپیانانەکان، ب دەیەم، ل٣٠ من وا زەن دەکەم ئەم لێکچواندنەی فلۆریا لێرەدا هەوڵدانی بووە بۆ کۆکردنەوەیەکی هۆشیارانە لە بەرامبەر وێنە ئەشکەوتەکەی ئەفلاتووندا کە بێگومان ناسیویەتی.

١٠٤- Omnem crede diem tibi diluxiss supremum.

١٠٥- دانپیانانەکان، ب شەشەم، ل١٦ (لەگەڵ تۆ) واتە لەگەڵ یەزداندا.

١٠٦- تەماشای پەراوێزی ١٠٠ بکە.



١٠٧- دانپیانانەکان. ب. حەوتەم، ل١

١٠٨- هەر ئەوێ

١٠٩- Frondem in silvis non cernis کە ئازادانە ئاوا تەرجەمە دەکرێ: (لەبەر چڕی داران، دارستانی نابینی؟).

١١٠- دانپیانانەکان، ب. حەوتەم، ل١

١١١- تەماشای نامەی یەکەمی پۆڵس بۆ قەرەنتینەکان بکە، بەشی ١٣، ئایەتی١٢. وەرگێڕانە لاتینیەکەی:

Videmus nunc per speculum in engnate tuncautemfacie ad taciem, nunccognoscoex parte, tunc autem cognoscam sicut et cognitus sum.

(کە ئەمێستا بەهۆی ئاوێنەیەکەوە بە پێچەوانەوە دەبینم و ئەوساش ڕوو بە ڕوو، ئەمێستا لە بەشێ تێدەگەم و ئەو دەمەش بە تەواویی (خواوەند) دەدۆزمەوە، بە جۆرێ کە ئەویش منی ناسیبێ).

١١٢- دانپیانانەکان، بەرگی٨، ل١

١١٣- دانپیانانەکان، بەرگی٨، ل١

١١٤- دانپیانانەکان، بەرگی٨، ل١

١١٥- دانپیانانەکان، ب. هەشتەم، ل٥

١١٦- پێشوو

١١٧- دانپیانانەکان، ب هەشتەم، ل٧

١١٨- دانپیانانەکان، ب هەشتە، ل٧و١٠

١١٩- دانپیانانەکان، ب هەشتەم،ل١١

١٢٠- دانپیانانەکان، ب هەشتەم، ل١٢

١٢١- Omnia vicerant amotem به بڕوای من لێرەدا فلۆریا ڕستەکەی (ڤیرژیل): (ئەڤین بەسەر هەر هەموو شتێکدا زاڵ دەبێ)ی هەڵگێڕاوەتەوە. چونکە لە دەقەکەی ڤیرژیل و بەپێی نەزمی وشەکان، ئا بەم جۆرەیە: ( Omnia vncit amor). پێویستە ئەوەش بە یاد بهێنرێتەوە کە ئانیاس باوکی ئەفرۆدیت، خواوەندی ئەڤین (ڤینۆس) بوو.

١٢٢- دانپیانانەکان، ب. هەشتەم، ل١٢

١٢٣- دانپیانانەکان، ب. نۆیەم، ل٦

١٢٤- هەر ئەوێ.

١٢٥- زاراوەی (زەلیلژن) هەر لە کۆنەوە لە زمانی نەرویجیدا هەبووە. بەڵام من هەرچەندی گەڕام بەکارهێنانی ئەم زاراوەیەم لە قاموسەکانی زمان یان لە دەقە کۆنەکاندا نەدۆزییەوە. لێرەدا فلۆریا سوود لە وشەی Crepundia وەردەگرێ کە دەکرێ بە شەقشەقە وەربیگێڕین کە جورێك لەیستۆکی منداڵانە، یاخود دەکرێ بە (هەلوور بەلوور) یان (زیگزاگ) لە وشەی Crepo بە واتای تریق تریق، جق جیق یان تەق تەق، وەربگێڕدرێ. بەڵام Crepida کە لە زمانی یۆنانیدا بە مانای (نەعل)یش دێت، لە هەمان کردارەوە وەرگیراوە. کەواتە ئەگەر بمانەوێ بە وردی ڕستەکە دابڕێژینەوە، ئەوە فلۆریا پاکژخوازی ئۆرلی چواندووە بە قاپقاپەکانی. من لە وەرگێڕانی دەقەکەی فلۆریادا سوودم لە وشەی (hem-pecked) وەرگرتووە.

١٢٦- دانپیانانەکان، ب. نۆیەم، ل١٠

١٢٧- دانپیانانەکان، ب.نۆیەم، ل١١

١٢٨- هەر ئەوێ



١٢٩- دانپیانانەکان، ب. نۆیەم، ل١٢

١٣٠- تەماشای وشەی یۆنانی hybris بکە، کە لە بەرامبەر تووڕەیی خواوەندان (nemesis)یان دادەنا. فلۆریا لێرەدا سوود لە وشەی لاتینی (super bia) وەردەگرێ.

١٣١- Tt hominem esse memento وا باوبوو کاتێ سەرلەشکرێکی سەرکەوتوو لە میانەی ڕێوڕەسمێکدا دەهاتە ڕۆماوە، ئەم وشانەیان بە گوێدا دەچرپاند.

١٣٢- تەماشای وتارەکەی سیسەرۆن بەرامبەر بە و ڕووی کاتیلینا (Catilina) بکە: (کاتیلینا، هەتا چەندێ بە هەڵە سوود لە هەدادانی من وەردەگری؟)

١٣٣- لە هاوینی ساڵی ١٩٤٥دا گۆڕی مۆنیکا لە ئۆستیا، لە لایەن دوو گەنجەوە کە بەرامبەر کەنیسەی سانتائۆرا زەوییەکەیان ئامادە دەکرد بۆ ئەوەی داری باسکەی لێ بچەقێنن، دۆزرایەوە.

١٣٤- Fit erranti medina confessio

١٣٥- Video meliora proboque, deteriora sequor تەماشای نامەی دووەمی پۆڵس بۆ خەڵکی ڕۆما بکە، بەشی حەوتەم، ئایەتی ١٩:

Non enim quod volo bonum hoc facio sed quod nolo malum hoc age.

(من ئەو چاکەی دەمەوێ نایکەم، بەڵام ئەو خراپەی نامەوێ، دەیکەم). هەروەها بڕوانە وەرگێڕانی کوردی ئینجیلی پیرۆز، ل(٢٨٥)

١٣٦- لە سەردەمی کۆندا و لەگەڵ نومایشکردنی تراژیدیاکانی یۆناندا، شانۆیی نیوە خواوەندە جەنگەڵێنەکان (ساتیر) پێشکەش دەکران. نیوە خوداییانی نێو براو، بوونەوەرگەلێکی سەربزێو، پڕجموجوڵ و نیوە خودایی بوون، کە تایبەتمەندی دەرەوەیان، نیوە بزن و نیوە مرۆڤ بوو. من لە بەکارهێنانی ئەم ڕستەیەدا لەلایەن فلۆریاوە و لە چواندنی کتێبی دەیەمی ئاگۆستین بە



بەشێکی ساتیری، گاڵتە جاڕییەکی زۆر بەدی دەکەم. بەتایبەتی بەهۆی ئاماژەدان بەو ئەسقەفە نیوە ڕۆحانییەی کە بەهۆی گیرۆدەبوون بە پێویستە جنسی و غەریزەییەکانیەوە، تا ڕۆژی مردن هاوار و نزایەتی.

١٣٧- دانپیانانەکان، ب. دەیەم، ل٣١

١٣٨- دانپیانانەکان، ب. دەیەم ل٣٠

١٣٩- ڕەنگە لێرەدا فلۆریا یاری بە وتەکانی (ئەشیل) لەبارەی ژیانی تارمایی ئاسای مردووەکان، بکات: (من پێمخۆشە خانوو بەکۆڵێکی ئازارچەشتووی سەر زەوی بم، نەك پادشایەك لە دونیای مردووەکاندا). (بڕوانە ئۆدیسەی هۆمێر). بەم پێیەش فلۆریا ئاگۆستین دەچوێنێ بە مردوویەکی زیندوو (لەنێو مردووەکانی کەنیسەدا). چونکە ئاگۆستین بۆخۆی چەندینجار ژیانێکی هاوشان بە (تامەزرۆییە جنسییەکان)، بە مردن دەچوێنێ.

١٤٠- دانپیانانەکان، بەرگی دەیەم، ل٣٠

١٤١- Multa petentibus desunt multa

١٤٢- یاری کردنە بە پەندە: Lupus pilum mutat, non mentem

١٤٣- زەنۆنی ئیلیایی (Zenon of elea) فەیلەسووفێکی یۆنانی دەوروبەری ٤٦٠ پ.ز، کە بڕوای وابوو تەنیا (بوون)ی نەگۆڕ حەقیقەتی هەیە و بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونە کەوتە بەتاڵکردنەوەی ڕای پێچەوانە، واتە فرە حەقیقەتی و گۆڕانی پووچەڵ کردەوە. لە پەیوەندی بەمەشەوە پارادۆکس (ناکۆکی) ئەشیل و کیسەڵی خستەڕوو. بەڵام ئەو یاریکردن بەو وشەیەی لێرەدا فلۆریا بە ئاماژەدان بە گوتەیەکی خوازراو دەیخاتەڕوو، لە هیچکامێ لە سەرچاوە ئامادەکاندا نەنووسراوە. زۆر ڕێی تێدەچێ یادوەری فلۆریا هەڵەی کردبێ.



١٤٤- دانپیانانەکان، ب. دەیەم، ل٣٣.

١٤٥- هەر ئەوێ

١٤٦- دانپیانانەکان، ب. دەیەم، ل٣٤

١٤٧- تەماشای پەراوێزی ژمارە (٤٠)بکە.

١٤٨- دانپیانانەکان، ب. دەیەم، ل٣٥

١٤٩- Si tacuisses, philosophus mansisses (ئەگەر ئا بەوجۆرە بێدەنگ دەمایتەوە، دەکرا قەبووڵکرابا کە ژیربیت). بە بڕوای من ئەمە ڕیزپەڕترین کۆئەنجامی فلۆریایە.

ئەم زاراوەیە کە لە کتێبی (ئارامییەکانی فەلسەفە)ی بۆتیۆسدا (Boethius) هاتووە ٤٨٠-٥٢٤ ز. نزیك بە سەدساڵ دوای نامەکەی فلۆریا نووسراوە. بەلای منەوە ئەمە شایەتێکی بەهێزە بۆ ئەو بانگەشەیەی کە دەڵێ دەبێ بۆتیۆس-ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ- ئاگای لە نامەکەی فلۆریا بووبێ، بەلای کەمەوە لە بەشێکی. بۆتیۆس نوسینەکانی ئاگۆستینی بە باشی دەناسین. کەواتە ناکردە نییە وای دابنێین دەقی (نامەکەی فلۆریا)شی هەرناسیبێ. بەلای کەمەوە لە هەندێ لە دەربڕینەکانی ئەو نووسینەی ئاگاداربووە.

١٥٠- دانپیانانەکان، ب. دەیەم، ل٣٥

١٥١- لە ئەفسانەکانی یۆنانەوە وەرگیراوە: (دایدالۆس (Dedalus)لە پەڕی پاڵندان و مێو، دوو باڵی دروستکردن تا لەگەڵ ئیکارۆسی (Icaru) کوڕیدا بفڕێ و لە دورگەی کرێت هەڵێ. دایدالۆس بە ئیکارۆسی گوت زۆر بەرز نەفڕێ و لە خۆر نزیك نەکەوێتەوە، چونکە دەبێتە هۆی توانەوەی مۆمەکە و... بەڵام ئیکارۆس

حەپەسانێ گوێی له ئامۆژگارییەكانی باوكی نەگرت و ئەوەندە لە خۆرەكە نزیك كەوتەوە هەموو پەڕی باڵەكانی سووتان و بەربۆوە ناو دەریا.

١٥٢- Epistula non etubescit، سیسەرۆ.

١٥٣- فلۆریا نووسیویەتی (تەماشای سەرێ و ئەستێرەی مشتەری بكە) واتە بنۆڕە خودای ئاسمانەكان. لێرەوە بۆ نموونە دەربڕینی (ژێر ئاسمان) دەبێتە sub Iove لەلای هۆراس و ئەمەش بە مانای (ژێر یەزدان) دێت.

١٥٤- لێرەدا فلۆریا یاری بە هەندێ وشەی پلاوتۆس (Plautus) دەكات: Oleum et operam perdidi (من گۆزەی ڕۆن و هەوڵدانەكانم نەشكاند). ئاماژەیە بە كیژێ كە بێهودە هەوڵبدا لەگەڵ ڕەگەزی بەرامبەردا سەركەوتن بەدەستبهێنێ.

١٥٥- تەماشای سیرۆس بكە:Mutis minatur, qui ninfacit iniuriam

١٥٦- Dixi et sdlvavi animam meam

١٥٧- Nunc est bibendum، هۆراس

١٥٨- Floret (لە ڕەگی كرداری floreo بە مانای پشكووتنی گوڵ دێت). وام بە بیردا دێ لێرەدا فلۆریاش یاری بە مانای ناوی خۆی دەكات. بەم جۆرەش دەبێ ناوی فلۆریا لە چاوگی flos،floris (گوڵ)ەوە وەرگیرابێ. تەماشای flora خواوەندی گوڵەكان بكە.

لە نزیكەی دوو كیلۆمەتری دەرەوەی ئۆستیا، پاشماوەی خەڵوەتگەیەكی ئاگۆستینی ماوە (قەدیس ئاگۆستین)، ئەم خەڵوەتگەیە لە سەدەكانی ناویندا، لە قەراخ رووباری فلۆریا floria دروستكراوە، لەو شوێنەی رووبارەكە دەڕژێتە دەریاوە. من لەو بڕوایەدام ئەمە نیشانەی ئەوەیە كە بێگومان نەریتی فلۆریا لە سەدەكانی ناوینەوە هەبووە.



١٥٩- Fructum avfructus كە دەتوانرێ بە مانای (بەكارهێنان (پاداشت) (سوود) لێكبدرێتەوە، بەڵام فلۆریا چوار ئینجیلی خوێندبۆوە، كەواتە بۆی هەیە سوودی لە پەندی درەختی هەنجیر وەرگرتبێ. تەماشای ئینجیلی مەتتا، بەشی٢١ ئایەتی ٢٢-١٨و ئینجیلی لۆقا، بەشی٣، ئایەتی ٦-٩. بكە: (بەیانییەكیان كاتێ دەگەڕایەوە شار، برسی ببوو، لەسەر ڕێگا درەختێكی هەنجیری بینی و لێی نزیك بۆوە، بەڵام هیچ میوەیەكی پێوە نەبوو، بۆیە پێی گوت لێرە بەدواوە هیچ میوەیەك بە خۆتەوە نەبینی و ئیدی یەكسەر درەختەكە وشك بوو.)

(ئەو بەسەر هاتەی گێڕایەوە و فەرمووی كەسێ دار هەنجیرێكی هەبوو، هاتبوو لە بەرەكەی بباتەوە و كەچی نەیدۆزییەوە. ئینجا فەرمانیدا بیبڕنەوە چونكە ئەوە سێ ساڵە دێم و بەرهەمی ئەم لقە هەنجیرە نابینمەوە. ئەمە بۆتە بارێكی گران بەسەر ئەم زەوییەوە، لە وەڵامدا وتی: قوربان ئەم ساڵ وازبهێنە با دەوروبەرەكەی بكێڵم و پەیینی تێبكەم، ئەودەم ئەگەر بەری گرت، گرتی و ئەگەر نا دوایی بیبڕەرەوە.

١٦٠- Vale! جۆری ڕەسمیانەی خواحافیزی لە نامەكاندا.

ڕێكەوتی تەواوبوونی ئەم وەرگێڕانە:

٢٠٠٤/١٠/١٧

## بەبەرهەمەکانی دیکەی وەرگێڕ

**ڕەخنە و هزر:**

- **دیاردەگەرایی تاراوگە**، چاپی یەکەم: دەزگای باران، سوید ١٩٩٥. چاپی دووەم: دەزگای ئاراس، هەولێر ٢٠٠٢
- **نووسین و بەرپرسیاری**، لە بڵاوکراوەکانی گۆڤاری بینین، ئەمەریکا ١٩٩٧
- **سۆفیستەکان**، چ١ ستۆکهۆڵم ١٩٩٨، چ٢ دەزگای سەردەم، سلێمانی ١٩٩٩
- **دنیای شتەبچووکەکان**، دەزگای سەردەم، سلێمانی ١٩٩٩، چاپی دووەم، ڕەنج ٢٠٠٥
- **کتێبی نالی**، دەزگای موکریانی، هەولێر ٢٠٠١
- **نەتەوە و حەکایەت**، دەزگای سپیرێز، دهۆك ٢٠٠٢
- **قەفەسی ئاسنین**، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی ٢٠٠٣
- **مێژووی هزری کۆمەڵایەتی**، زنجیرەی هزر و کۆمەڵ ٢، هەولێر ٢٠٠٣
- **هاوکاتی و هاوشوناسی**، دەزگای سپیرێز، دهۆك ٢٠٠٤
- **لە پەیوەندییەوە بۆ خۆشەویستی**، دەزگای سپیرێز، دهۆك ٢٠٠٤

**بەرهەمی ئەدەبی:**

- **گۆرانییەك بۆ گوندە سووتاوەکان** (شیعر)، کۆپنهاگن ١٩٨٩
- **کۆپنهاگن!** (شیعر)، کانونفرهنگ ایران، دانمارك ١٩٩٤



- **زمانی عەشق، زەمەنی ئەنفال** (شیعری) چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی ٢٠٠٠
- من و مارەکان (چیرۆك) مەڵبەندی لاوانی میدیا، سلێمانی ١٩٩٩

**وەرگێڕان:**

- ئەفسانەی خۆشەویستی (سەمەد بیهرەنگی) ئەفسانەچیرۆك، چاپخانەی سەرکەوتن، سلێمانی ١٩٨٣
- **دەنگی پێی ئاو** (سهراب سپهری) چ١، ١٩٨٩، چ٢ کۆپنهاگن ١٩٩٠
- **در امدی بر شعر معاصر کُردی**، کۆپنهاگن، ١٩٩٠
- **پیدرۆپارامۆ** (ڕۆمان)، خوان ڕۆڵفۆ (بەهاوکاری ئازاد بەرزنجی) دەزگای سەردەم، سلێمانی ١٩٩٩
- **دەروازەکانی کۆمەڵناسی** (منوچهر محسنی)، بەهاوکاری کۆمەڵێ وەرگێڕ، دەزگای موکریانی، هەولێر ٢٠٠٢
- **ئەلبوومی کیژی جنۆکان** (چیرۆکی منداڵان لە دانمارکییەوە)، دەزگای سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٢.
- **خۆبەکۆیلەکردن** (ئەتین دۆلابۆتی) بە هاوکاری لەگەڵ مراد حەکیم. دەزگای موکریانی، هەولێر٢٠٠٥.